## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : فەلسەفەی مێژوو

بابەت : لێکۆڵینەوە

کۆمپیو تەر : جلیل حسین

شوێنی چاپ : چاپەمەنی گەنج

نۆبەتی چاپ : چاپی دووەم

ساڵی چاپ : ٢٠٠٥

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

*ژمارەی سپاردن : ( ٨٦ ) ی ساڵی ( ٢٠٠١ ) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێ درا*

## پێزانین

بە بۆنەی بە بەرهەم گەیشتنی ئەم فەرهەنگۆکەوە بە پێویستی دەزانم لە کانگای دڵەوە سوپاسی ئەم دۆستانە بکەم :

١. کاک قادر وریا کە هاندەری سەرەکی بوو بۆ ئەوە ئەم بەرهەمە بۆ چاپ ئامادە بکەم.
٢. کاک عومەر غولامعەلی کە بە حەوسەڵەوە ئەم فەرهەنگۆکەی پاکنووس کردەوە.
٣. کاک سەلاح میهرپەروەر کە پیتچنینەکەی بە دەزگای کامپیووتەر گرتە ئەستۆی خۆی.

بەو هیوایە ئەوان لە کاروباری ژیان و خەباتیان دا سەرکەوتوو بن و کوردیش رۆڵەی لەو بابەتەی زۆر و زۆرتر بن .

## پێشەکیەکی کورت:

لە قۆناغی مرۆڤایەتیدا مێژوو ڕۆڵی کاریگەری بینی بۆ بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، ئەو ڕۆڵانەی مێژوو دەیبینی هەر خۆشی تۆماری ڕووداوەکانی خۆی دەکردو نرخ و بەهای خۆی سەپاند بەسەر سەرجەم مرۆڤایەتیدا، دیارە ئەو گەلانەی لە مێژوو گەیشتن و بەهای مێژوویان زانی بوونە خاوەن مێژوو، ئەوانەشی بایەخیان بە مێژوو نەدەداو نرخیان نەدەزانی بێبەش بوون لە مێژوو، ئەمەش وای لە زانایان و فەیلەسوفانی مێژوو کرد کە پێناسەیەك بۆ مێژوو بکەن و زیاتر لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلەکانی مێژوو بکەن، دیارە ئەم پرسیارانە ئەوەندەی تر دەرگای لێکۆڵینەوەی خستە سەر پشت، بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لە مێژوو، مێژوو چیە؟ کێ مێژوو دروست دەکات؟ مێژوو سەرەتاو کۆتایی هەیە یان نەخێر؟ مێژوو ڕادەوەستێ یان بەرەوپێش دەچێ؟ ئایا مێژوو دووبارە دەبێتەوە؟ چۆن و کەی؟ جیاوازی مێژوو لەگەڵ زانست چیە؟ ئایا مێژوو بەشێکە لە زانست؟ ئایا مێژووش

زانستێکە وەك زانستەکانی تر؟ ئەمانەو دەیان پرسیاری تر، دیارە سەدەی ناوەڕاست و تا سەدەی ڕینیسانس مرۆڤ بیری لەو جۆرە پرسیارانە دەکردەوەو مشت و مڕی لەسەر کراوە تا وای لێهات لە سەدەی ڕۆشنگەری بووە بەشێك لە زانست و لە وەهم و خورافات پاك کرایەوە یاخود بڵێین بە زانست کراو بەرگی فەلسەفی پێ بەخشراو لەگەڵ فەلسەفەدا ئاوێتە کراو دیاردەی (فەلسەفەی مێژوو) هاتە ئاراوە، واتە مێژوو فەلسەفی پێ کراو چەند لقێکی فەلسەفیانەی گرتەوەو فەیلەسوفان لێکۆڵینەوەی تایبەتیان لەسەر مێژوو کرد لە ڕووی فەلسەفیەوە تا ئەوەی مێژوو بە فەلسەفە بکەن، دیارە لەو کەین و بەینەدا چەندان قوتابخانەی جۆربەجۆر سەری هەڵداو هەر قوتابخانەیەك بە شێوەیەك لە فەلسەفەی مێژووی دەکۆڵیەوە، تەنانەت پیاوانی ئاینیش کەوتنە خۆیان و مێژوویان لە ڕێگەی دینەوە ڕاڤە کرد.

ڕاڤەکاران هەریەکە لە دیدو ئایدۆلۆژی خۆیانەوە ڕاڤەی مێژوویان دەکرد، لە دیدی ئابووری و ئایدیالی و مەتریالیزمی و کۆمەڵایەتی و ڕۆح و دین و سایکۆلۆژیەوە.. هتد، جا بۆ ئەوەی خوێنەری کوردیش لەو بەشە گرنگەی (فەلسەفەی مێژوو) بێبەش نەبێ و زانیاری هەبێ دەربارەی، هیواردارم خزمەتێکی بچووك کتێبخانەی کوردیم کردبێ.

ڕەحیم سابیر

# دەروازەیەك بۆ فەلسەفەو مێژوو:

فەلسەفە زانست و لێکۆڵینەوەی یاساکانە، بەشێوەیەکی گشتگیری لە پێشکەوتنی سروشت و کۆمەڵ و بیرکردنەوەی مرۆیی، کە فەلسەفەی مێژوودا ڕەنگی داوەتەوە، ئەمەش بۆ گەڕان بە شوێن یاسا گشتییەکاندا کە ئامانجی دەربڕینێکی شاراوەیی دەکات، کە لە میانەی مێژووییدا دەگاتە ئامانج، زاناو زانایانی کۆمەڵناس و مێژوونوسان توێژینەوەیان ئەنجامدا دەربارەی مرۆڤ و دەوروبەر هەروەها کاریگەری مرۆڤ لەسەر دەوروبەرو کاریگەری دەوروبەر لەسەر مرۆڤ، ئامانج و مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ زیاتر تێبگات لە دەوروبەرو زاڵبونی بەسەر سروشت و دەوروبەردا دوایش بتوانێ بیخاتە خزمەت مرۆڤایەتییەوە، ڤۆلتێر (١٦٩٤-١٧٧٨) نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی. یەکەم کەس بوو کە گوزارشتی لە فەلسەفەی مێژوو کردووەو بەکاری هێناوە، مێژوونوسانی سەردەمی ئەگریکی (توسیدیدس ٤٥٦-٣٩٦) هەوڵی ڕاڤەکردنی ڕووداوە مێژووییەکانیان کرد بۆئەوەی ئەو گوزارشتە

بەکاربهێنن واتە (فەلسەفەی مێژوو)، ڤۆلێتر بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەکاری هێنا، لە رووی فەلسەفیشەوە پرۆگرامەکەی بۆ دامەزراندنی ئەپستمۆلۆژی مێژوویی بوو بە پرۆسەیەکی ئاوەزی کە پاڵپشت بێ بە دیدی رەخنەگرانە بۆ ئەوەش پشتی لەو شتانە کرد کە گومان بوون وەك خورافەو هەندێ چیرۆکی درۆو هەروەها مێژووی لە ئەفسانەو پیاهەڵدان پاککردەوە، بۆ ئەوەش بایەخی نەدەدا بە جەنگەکان و ئەو پەیمانە رامیاریانەی کە واتایان نەبوو، بەڵکو کردنیە لێکۆڵینەوەیەکی ئەپستمۆلۆژی رەخنەیی، (کە ئامانجی راست کردنەوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بوو لە مێژووی سیاسی و سەربازی بۆ فەلسەفەی شارستانیەت)، ئامانجی رەخنەی مێژوویی ئەوەیە (ئاوەزی [illegible] لەو خورافانە ئازاد بکرێن لە پێناو ئازادی و رۆشنگەری و لێکۆڵینەوە عەقڵانیەکان)، کاری فەلسەفەی شارستانێتی ئاراستەکردنی تو[illegible]ژینەوەی مێژوویی‌یە، بە بایەخترە لە جەنگ و ژیانی پادشاو رووداوەکانی کۆشکی پادشاکان، واتە بە دواچوونی کاروانی ئاوەزی مرۆڤە لە هەموو دیاردە مرۆیی‌یەکانەوە، لای عەرەبەکان (ابن خلدون) بەدامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە ناوبانگی دەرکردووە، کە ناوەوەو دەرەوەی مێژوو دەپشکنێت هەروەك خۆی دەڵێت (لە دەرەوەی تەنها دەنگ و باسی رۆژانەو دەوڵەتانی پێشوون لە پێش سەدەی یەکەمدا، لە ناوەوەدا تێروانین و پشکنینەو هۆدۆزیی بوونەوەرەکانەو هەروەها ر[illegible]ازەکانە

وردبین و زانستیانه بە چۆنایەتی ڕووداوەکان هەروەها هۆکارە قوڵەکان بەوەش ڕەگەزە لە حیکمەتداو دروست کەرە لە زانستدا) (ابن خلدون) مێژوو بە زانستێك لە زانستی حیکمەت دەزانێ، حیکمەتیش لە چوارچێوەی تێگەیشتنی سەردەمەکەی فەلسەفە بووە، لەبەر ئەوەش مێژوو لای (ابن خلدون) ئەپستمۆلیژێکی فەلسەفیانەیە، هەر بۆیە بووە پێشەوای مێژوونوسە عەرەبەکان،

فەلسەفەی مێژوو لە لایەنی مێژوویی‌یەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆن دوایش لەسەر دەستی بیرمەندانی سەردەمی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەهەمدا پەرەی پێدراو پێشکەوتنی بەخۆوە دی وەك (ڤۆلتێر/ هێردر/ کرندورسیە/ منتسکیو) هزری هۆدۆزیان هێنایە ئاراوەو بانگەشە هزری (یەکەی کردارەکی مێژوویی)یان کردو جەختیان لەسەر کاریگەری دەوروبەرو جوگرافیاو کۆمەڵ دەکردەوە لەسەر مرۆڤ بۆ ڕاڤەی مێژوو، هیگل وای دادەنا کە مێژوو کردارێکی پێشکەوتنی خۆیەتی‌یە بۆ ڕۆح یان بۆ هزر، یەکەیەکی ناوخۆیە کە یاساکان بڕیاردەر دەبن بەسەریدا، مارکس و ئەنگلس ماتریالیزمی مێژوویی‌یان دۆزیەوە لەسەر بنەمای تیۆری زانستی و هەروەها فەلسەفەی هاوچەرخ توینبی و شبنگلر خوێنەرو خەڵکیان زۆرە ئەویش بەهۆی تێڕوانینیان بۆ مێژوو، فەلسەفەی مێژوو بۆ دوو بابەتی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ڕاڤەکردنی ڕووداوە مێژوویی‌یەکان:

## ١-كۆوتەی گشتی:

بۆ یەکەم جار ڕووداوە مێژوویی‌یەکان لە دیدی فەیلەسوفەکاندا وەك دوورگە پەرش و بڵاون و پەیوەندیەکانیان لە نێواندا ون بووە، وەك کۆمەڵێك ڕووداوی لە سەریەك کەوتوو دەردەکەون، ئەمەش ئەوو دیاردەیەیە، بەڵام لە ڕاستیدا فەیلەسوف ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە ڕووداوە ڕاستی‌یە مێژوویی‌یەکان شێوەیەکی پەرش و بڵاو بن، خۆ بەدەستەوەدانی خێرپێکردنی نابێ لە میانەی مێژوودا، یان لە بزوێنەری مێژوودا، هەروەها ئەوەش ڕەت دەکاتەوە کە مێژوو زنجیرە ڕووداوێك بێت کە لە ماوەی کورت کورتدا حاڵەتەکانی ناخۆشی و شادی واتە لە نێوانیاندا، فەیلەسوفی مێژوویی مەرج دادەنێ بۆ یەکێتی ئەندامەکان لە نێوان ڕووداوی مێژوویی کە جیاوازیان تیادایەو کە لێك دابڕان و دژ بە دژی تیادا دەردەکەوێ، بنچینەی هەست پێ کردن لە فەلسەفەی مێژوودا پێك هاتنە لە نێوان بەشەکانی مێژوودا ئەمەش ئەو بابەتەیە کە فەیلەسوف لێی دەکۆڵێتەوەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و پلانی بۆ دادەڕێژێ و لەو دیدەوە سەیری دەکات. فەلسەفەی مێژوو ئەوە ڕەت دەکات کە توێژینەوەکەی بەند بێت لەسەردەمێك لە سەردەمە مێژوویی‌یەکان هەروەها ئەوەش ڕەت دەکاتەوە کە لێکۆڵینەوەی تایبەت بێت بۆ کۆمەڵگایەکی تایبەت هەوڵ دەدات هەمرو بەشەکانی جیهان

کۆبکاتـە ، لـە چوارچێوەیـەکدا سـەرەتایی‌یەکەیی و کۆتایی‌یەکـەی لەوانەیـە . ەو دواساتە بێت کـە فەیلەسـوف تیـایدا دەژی یـان ئەوسـاتە دەشکێنێ کە ئەمەش ڕاڤەکردنێکی خەون بینانە دەبێت بۆ پاشەڕۆژ.

## ٢-هۆدۆزی یان هۆکار:

چەمکی هۆدۆزی یەکێکە لە چەمکەکانی فەلسەفی، دەتوانین ئەو چەمکە لـە کتێب کانی مێژوونوسـاندا بدۆزینـەوە، بـەڵام چـەمکی هـۆدۆزی لـە فەلسـەفەی مێـژوودا جیـاوازە لـە چـەمکی هـۆدۆزی لـەلای هـەندێ مێژوونوسـانی تـر، چـەمکی فەلسـەفی خـۆی وەك گشـتگیری و ڕەهـایی دەبینێتـ ەوە بـەڵام چـەمکی مێژوویـی بـەندی بەشـەکان و بـە ڕێـژە مێژوویی ـەکانەوە مۆرکراوە. وەك زانراوە مێژوونوس هەمیشە پیشت بە مێژوو دەبەستێ بۆ هۆدۆزی بەڵام هەمیشە کۆت دەبێت لە پێشبینیدا بۆ هۆکاری ڕووداوی بەشـەکان کـە پابـەندە بـە چوارچێـوەی مێـژوو یـان تێڕوانینی لـە تاکەکەسـی و زەمـان و شـوێن، بـەڵام فەیلەسـوفی مێـژوو هـۆدۆزە بەشـە ڕووداوە تاکەکەسـیەکان دەگوێزێتـەوە بـۆ یـەك هـۆدۆز زۆرجار بۆ دوو هۆدۆز کە لەوێوە ڕاڤەی مێژووی جیهانی دەکات، لەسەر ئـەو بنچینەیـە ڕووداوە مێژوویی‌یـەکانی پـێ دروسـت دەکـات و لـە چوارچێوەی ئاوەزدا لێی دەدوێ یان وەسفی دەکات، بە ڕای (کروتشـە) فەیلەسوفانی مێژوو ئارەزووی ئەوە دەکەن لە مێژووی جیهان بزانن و لە

چەند لاپەڕەیەکی دیاریکراودا شتە نهێنییەکان ئاشکرا بکەن. دەپرسن: چۆن دەتوانین مێژووی جیهان بزانین، تەنها بەکاری یەك کەس؟. شێوەی فەیلەسوفانی مێژوو لە فەیلەسوفانی ڕامیاری دەچن ئەوانەی یۆتۆپیایان دامەزراند، مۆدێلێکی خەیاڵی و نمونەیی وێنا دەکەن کە لە بەرژەوەندی هەموو گەلاندایە لە هەموو سەردەمێکدا، حاڵی فەیلەسوفانی مێژوو هەر ئەوەیە، لە مێژووە جیهانیەکاندا مێژووی هەموو کۆمەڵەکان لە هەموو زەمانێکدا دادەنێن، فەلسەفەی مێژوو تێکەڵە لە نێوان وێناکردن و خەیاڵدا، فەیلەسوفانی مێژوو بانگەوازی ئاشکرا کردنی ناوەڕۆك دەکەن کە مێژووی جیهانی لەسەر ڕادەوەستێ لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بەڵام (تشالز نومان) کاری فەیلەسوفانی مێژوو بەوە وەسف دە[illegible]ات دەڵێ (پێکهاتەیەکی فەلسەفی پێشینە لەسەر تایبەتییەکانی سەدە[illegible] ڕابردوو دامەزراوە وەك بۆی دەچن، لە زنجیرە ڕووداوە پەشێوەکان[illegible] کە دوور خراونەتەوە وەك شتێکی لۆژیکیانە)، وای بۆ دەچن کە مێژوو [illegible]ارمانجی هەیە کە فەرهەنگی زۆریان دانا بۆ ناوو چەمکەکەی، [illegible]یان نا پێشکەوتن/ پێشکەیشتن/ سەردەمی ڕۆشن/ بە ئاراستەی بۆچ[illegible]ونیان کە لە تۆمارکراوەکاندا بەڵگەیان بۆ دەردەهێنا کە بشێوێ بۆ بەه[illegible]ەکانیان؛ لە هەمان کاتدا چاویان پۆشی و ڕایان گەیاند لەو ڕووداوانەی [illegible]ە لەگەڵ بۆچونیاندا یەك ناگرن و هیچ نادەن بەدەستەوە.

مێژوونوسان دەڵوەستەیەکی ڕەخنەییyan هەبوو لە کاری هۆدۆزیدا کە فەیلەسوفانی مێژوو پسپۆڕیان تێدا دەکرد ئەمەش بەدوا گەڕانەوە بوو لە وتەی یەکانیەتی هۆدۆزی، هەڵوەستەی ڕەخنەیان بەدوو لقدا دابەش بوو:

یەکەم: ئەوانەی جیاوازکاری دەکەن لە نێوان هۆدۆزی مێژوویی و هۆدۆزی لە فەلسەفەی مێژوودا، یەکەمیان ئەزموونگەری دووری، واتە مێژوونوس هۆکان دەچنێتەوە، بەلام دووەمیان تێڕامانی قەبەلی پێشینەیییە (کروتشە) دەڵێ (فەلسەفەی مێژوو ئامادەو پێکهاتەیە وەك لەوەی تۆمارکردن و ڕاپۆرت بێت. ئەوان بۆ هەموو گەلێك مێژوویەك دادەنێن شارستانیەت بەرەنگاربوونەوەیەو هزرێکی پێشینەیە بۆ حەلکردنی ئاڵۆزە کتوپڕیەکان لە سەردەمی فەیلەسوفدا دوایش مێژوو گاڵتەجاڕی دەکات بە هەموو ڕابردوو و ئێستاو تەنانەت پاشەڕۆژیش کە لە پێناو دووپات کردنەوەی قەرزەکەی بۆ حەل کردنی ئاڵۆزەکە بۆ ئەوەش چەند نموونەیەك دەهێنینەوە کە فەیلەسوفانی مێژوو قەرزەکانیان چارەسەر پێکردو مێژوویان خستە خزمەتییەوە.

لە بیروباوەڕی (سان اوغسطین)دا دەبینین کە کڵێسە زاڵ دەبێت بەسەر دەوڵەتدا لەسەر ئەو بنچینەیەی چوارچێوەیەکی بۆ دانا لەچەمکی (شاری خودا) یان (شار زەوی)دا (اوغسطین) هەموو شارستانیەتە کۆنەکانی کردە خزمەت بۆ یەکگرتنی یان دوانەیی کردنی ئەو دوو

شارەدا واتە (شاری خوداو شاری زەوی). سەیری هیگڵ دەکەین کە ئەویش مێژووی بەکارهێنا لە پێناو هزری میتافیزیکی کە ئەویش ڕۆح بوو بۆ سەربەست بوونی خۆی، مارکس سەرمایەداری و مەسەلەی ئابووری کردە خزمەت مەسەلە مێژووەکەیی و هەر لە مەسەلەی ئابوورییەوە ڕاڤەی مێژووی کردوو ئەویش بۆ بەرگری کردن لە هزرەکەی.

دووەم: یەکایەتی هۆدۆز: لەو کاتەدا هۆدۆزی لە مێژوودا زۆر دەبێت کە ڕووداوەکان زۆرەبن، تەنانەت مێژوونوس زۆر هۆ تۆمار دەکات بۆ یەك ڕووداو، بەرامبەر ئەوەش دەبینین فەیلەسوفانی مێژوو هۆکارەکانی یان هۆدۆزەکان لەیەك هۆدا کۆدەکاتەوە. لەبەر ئەوەی مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان ناکەن بەڵام چالێك هەڵدەکەنن لە پشتی ڕووداوەکان بۆ ئەوەی سەپاندنێکی میتافیزیکیانە بدات بە دەستەوە کە یەك هۆدۆز بێت، بەڵام هۆدۆز دەست نایات بۆ ڕاڤەکردنی هەموو ڕووداوە مێژوویییەکان، لێرەشەوە فەیلەسوفانی مێژوونوس هەڵدەستن بە هەڵبەستنی هۆدۆزیان. ئارمانجیش لەوە داپۆشینی ئەو درزانەی کە لە ڕاڤەکردنیان دەردەکەون. لەسەر ئەو بنچینەیەش ڕاڤەکردنەکانیان سەپاندنی توندوتیژی پێوە دیاربوو بەرامبەر بە مێژوو، ئەو توندییە بێدادیە لەوانەیە بۆ دواڕۆژ پەرەی هەبێت، بۆ ڕاستی بۆچونمان ئەویش ڕاڤەکردنی (سان اوغسطین)ی دینییە بۆ مێژوو. کە ڕاستی هەڵگری دیاری دەوکرد لە سەرەتای دروست بوونەوە تا ڕۆژی قیامەت

(هەستان ە) هەروەها ڕاڤەکردنی مارکس بۆ کۆمەڵی سەرەتایی لە ڕابردووی پێ شێل کراودا بەهەمان هۆدۆز کە پێشبینی دەکرد بە فردۆسی ەوی کە نوێنەرە لە کۆمەڵێکی بێ چین لە پاشەڕۆژدا.
دیارە مێ ڕو لێکۆڵینەوەیە لە ڕابردوو، ڕابردووش لە چرکەی یەکەمی ئێستادا . دەوەستێ، بەلام فەیلەسوفانی مێژوو چوارچێوەی ئەوەیان پچڕاندو .بوون بۆ پاشەڕۆژ، بەڵکو پاشەڕۆژیان کردە ئارمانج، دوایش بوویەری مێژوویی یان سرپەوە بە لایەکی ناوازی میتافیزیکیان گۆڕیانەو . نموونەش بۆ ئەوە ئەو ڕوحەی کە گوزارش لە هۆشی خۆی دەکات هەروەها کۆمەڵی بێ چین هەروەك لە داستان و ئەفسانەکاندا دەرکەوتورە، کە خێر بەسەر شەڕدا سەردەکەوێ یان ڕووناکی بەسەر تاریکیدا سەردەکەوێ. (کروتشە) بەرابەرەکی دادەنێ لە نێوان مێژوو فەلسەفەی مێژوودا. بەرابەرەکی‌یەکەی لە کاتی خۆیدا سروشتی بابەتی فەلسەفەی مێژووی ئاشکرا کرد، وای بۆچوو کە فەلسەفەی مێژوو بە دووی ڕەهای ناسنووردا دەگەڕێ لە ڕێژەیی دیاریکراودا، فەیلەسوفانی مێژوو بە دوای ناکۆتایی‌دا دەگەڕێن لە کۆتایی‌داو جیاوازکاری لە بوویەردا، دیارە کە مێژوو لە زنجیرخان پێك هاتووە لە ڕووداو کە گرێ دراوە بە کۆمەڵی هۆی بەش بەش. بەلام کە مێژوو گرێ درا بە فەلسەفە خۆی دەسڕێتەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی هەریەك لە (هزر بۆ فەلسەفە) و (واقیع بۆ مێژوو).

# فەلسەفەی مێژوو:

دوو پرسیار دەوروژێنین: ئایا فەلسەفەی مێژوو لە بابەتەکانی زانستی مێــژوودا پۆلێــن دەکرێــت؟ ئایــا مێژوونوســان دەتــنی بنــاادادەنێن؟ لێکۆڵینەوەی مێژوویی وا لە لێکۆڵەوەر دەکات کە لە دەریایەک ، ڕووداو و ڕاستییەکاندا بخنکــێ کــە تەنانــەت ڤۆڵتــێر دەڵــێ (دوای ئــ وە هیــچ حیکمــەتێک وەک ئێش خۆی نابێ وەک ئەوەی لە پێشدا هــەبێ بوو) ئەمــە لەلایەک و لە لایەکی ترەوە لێکۆڵەوەر ا خۆی گرێ دەدات بە ڕا ردووەوە تا وای لێ دێت وەک (دیکارت) دەڵی (ئــەوەندە گرێی/ پــەیوەند ی/ دەبێ کە لە ئێستا نامۆ دەبێ تا کۆتایی پێدێت بەوەی کە نامۆ بێت لە نیشتمانەکەی) سەرەڕای ئەوانەش مێژوو مرۆڤ وا لێدەکات ، ئازاری ڕابردوو بچێژێ. بەڵام حاڵەتی ئەفراندن لە هزری مرۆڤدا کەو لە ڕابردوو وانــە وەردەگــرێ لەســەر ڕای (نیتشــە) وەک دەڵــێ (هــەر دە ێ لێــک جیابێتــەوە، حاڵــەتی مێــژووی سروشــتیانەی دژ بــە دژ لەگــە حاڵــەتی

داهێناندا ئەمەش گریٚ دراویە بە ڕابردوو، بۆ دواوە بەڵام ئەمەی دوایی هەنگاوێکە بۆ نادیار بۆ پێشەوە).

بە ڕاستی فەلسەفەی مێژوو ئەپستمۆلۆژی مێژوویی چارەسەردەکات ئەویش بەوەی کە ڕووداوە مێژوویی یە یەك لە سەریەکەکان و ئەوانەشی کە دێن ماناو ئارمانجێکیان پیٚدەدات ئەویش بەوە دەست پیٚدەکات وەك (کروتشە) دەڵیٚ (کێشەیەك لە ئێستادا ڕوودەدات بەڵام وا لە مرۆڤ دەکات کە هەمیشە جێگیر بێت لە ئاویداو گریٚ دراوی بێت. دوایش بۆ نێو قوڵایی ڕابردووی هەڵناگریٚ وای لیٚ ناکات کە ئێستای نامۆ بکات، ئەویش پێچەوانەی مێژوو لە ئایندە بوونیدا بۆ پاشەڕۆژ مرۆڤ وا لێناکات بچێتە ژێر ئازاری ڕابردووەوە لە دوایشدا بەرگی ئایینی پۆشیوە دژی ئەوەی (نیتشە) ناوی لێنا بە نەخۆشی مێژوو واتە کارەساتی ئاودز کە ڕابردوو تووشی لووت وشکی دەکات ئەویش بەولانی بۆ خۆی.

مێژوونوسان ناویان لێناوە نەزانینی فەیلەسوفانی مێژوو بە ڕووداوە مێژوویی یەکان کە ئەویش لە کەرەستەی مێژوویی یەکانیاندا کە تیۆرەکانیان لەسەر بنیات دەنێن ئەمەش لە ڕاستیدا تەنها ڕزگاربوونە لەو فەیلەسوفانە بۆ ئەوەی نەبنە قوربانی نەخۆشی مێژوو) فەلسەفەی مێژوو کەمتەرخەمیەکانی فەلسەفە پڕ دەکاتەوە، فەلسەفە توشی دڵەڕاوکێ بووە سەرچاوەکەشی هەڵپەی فەیلەسوفە بۆ گەیشتن بە ڕاستی، بە بەردەوامی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات بۆ گەیشتن بە ڕاستی،

زۆرجار دەترسێ لەوەی کە ئەو ڕێگایە هەڵە بکات چونکە لە بەرزی‌یەوە لێی دەڕوانێ و مامەڵە لەگەڵ جیهانی ئەبستکراتدا دەکات، هەر بۆیە دەبینین فەیلەسوفی مێژوو کەرەستەکەی لە مادەی واقعی مێژووەوە وەردەگرێ، کەواتە مێژوو فەلسەفە توندوتۆڵ دەکات بەو شێوەیەی کە نایەوێ بەرز بفڕێ (دوور لەم جیهانەمان و فەلسەفە بە مێژوو بەرزدەکرێتەوە تا لە قوڕو لیتاوو خوێنی ڕابردوودا نەچەقێ، مێژوو لە فەلسەفەو حیکمەت وەردەگرێ. هەروەها فەلسەفەش لە مێژوو واقع وەردەگرێ هەردووکیان ئەوی تریان تەواو دەکەن و دوایش (زواج) لە نێوانیاندا دروست دەبێ سەرەڕای ئەوەی کە دژایەتی هەیە لە نێوان فەلسەفەو مێژوونوساندا، فەلسەفەی مێژوو بۆ ئەوە پەیدا بووە کە پێدا پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ لە مەز جێبەجێ بکات. هەرکاتێك مرۆڤ دووچاری ناخۆشی و مەترسی و چارەنووسی نادیار بووبێت ئەوکاتە پشت بە مێژوو دەبەستێت و ڕابردوشی پێدەبەخشێ، لێرەوە نموونەی هەندێ لە مێژوونوشان دەهێنینەوە ئەوانەی لە مێژوو دەکۆڵنەوە وەك (نیقولا بردائیف) سەردەمی هەرەسەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، (کە هەمیشە بیری دەکردەوە لە ڕابردوویی و چارەنووسی کە جێی بایەخە بۆ ڕاڤەکردنی مێژوو و هۆ دۆزیەکەی). (سان اوغسطین) هەوڵی ئەوە دەدا کەمێژوو ڕاڤە بکات کە بە دواداچوونی کرد لە جیهانی کۆن و ڕووخاندنی ڕۆمادا، شارستانیەتی ئیسلامیش کە قۆناغی لەناووچوونی

هاته بەر ابن خلدون)ی خستە هەڵپە بۆ دانانی یەکەم تیۆر لە فەلسەفە: ێژوودا، هەروەها چوونە ناوەوەی ئەرتەشی ناپلیۆن بۆ نێو خاکی ئە یا ئەمەش جەختی کردە سەر هیگل کە قسە بەناوبانگەی بڵێ (کوێ بووی منیرفا هەڵنافڕێ تا کازیوە هەڵدێ) واتە باشترین قسەی د انە دەرناچێ گەر لە باشترین باروودۆخدا نەبێت، کە هێنایە بۆ حیکم ئەمەش تیۆرە بەناوبانگەکەی بوو لە مێژوودا.

ترسی شە ڵرو توینبی لەسەر جارەنووسی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دوای جەنگی ..انی یەکەم ئەو ..ی کرد واتە ئەو مەترسیە وای کرد کە ڕێبازێک ..ڕرین لە فەلسەفەی مێژوودا.

کارل یاس..ر دەڵێ (سەردەمەکان پێویستی بە مێژووی مرۆڤایەتی هەیە تا پێوانە..انمان بداتێ کە دەتوانین تێبگەین لەو مانایەی کە ئەو ڕووداوە چییە لەم سەردەمەماندا. لە قەیرانی هوشیاریدا یارمەتیمان دەدات بۆ تێڕامان لە مێژوو بۆ ئەوەی خۆمان بناسین و هەڵوێستمان بناسین.. ..ان بۆ هیچ. یان بۆ ڕاپەڕین). زانستی سروشتی هەر لە سەدەی ..دەوە پێشکەوت و کاریگەری خۆی کردە سەر زانستی مرۆیی، ..عۆی پێشکەوتنەش لە زانستی سروشتیدا وەك پەیڕەوێکی ئەزموونی چووە سەر، زانایانی مرۆیی پرسیاریان دەکرد کە تا چەند پەیڕەوی زانستی سروشتی پراکتیزە دەکرێ لە زانستی مرۆییدا بۆ ئەوەی بە ..ڵی پێشکەوتنی هاوشێوە بەدەست بهێنن، ئەو پەیڕەوەیان

پێش خست بەلام زانایان ئەو بابەتە زانستیەیان چارەسەر کرد وەك (بیکون/ لوك/ هیوم) لە سەروو هەموویانەوە (گالیلۆ/ کبلر/ نیوتن) و بایەخی (فرنسیس بیکون) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە داهێنەری پەیڕەوی ئەزموونگەری نوێیە (ئۆرگانونا)ی نوێی داهێنا کە هاوشێوەیە یان هاوکێشەیە لەگەڵ (ئۆرگانون)ی ئەرستۆدا (بیکون) ئامارەی بەوەدا کە گەڕان بە دوای سروشتدا و ئاشکرا کردنی و چۆندایەتیەکەیدا تەنها بە پەیڕەوی تێخوێندن دەبێت ئەمەش بۆ ئەوەی زۆرتر لە دیاردەکان کۆبکرێتەوەو بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دیاردانەی لە بارودۆخی جیاجیادان بۆ گەیشتن بە یاسا بۆ ئەوەی ڕێ بکرێتەوە بۆ مرۆڤ کە زاڵ بێت بەسەر سروشتداو بیخاتە خزمەت خۆی، ئەم پێشکەوتنە ـ زانستی سروشتیدا کاریگەری کردە سەر زانستی مرۆیی دەتوانین ئە. لایەنە کاریگەریانە بەم خاڵانەی خوارەوە دیاریبکەین:

١- پەیڕەوی زانست:

بانگەزاز لەلایەن فەیلەسوفانی مێژووەوە بۆ ڕێگرتنە بەر پەیڕەوی زانستی سروشتی، مەبەستیش دۆزینەوەی پەیڕەوێکی خوێن ئەوەی مێژوویییە کە هەستی بە کۆکردنەوەی زۆرترین لە ڕووداوە مێژووییەکان بۆ گەیشتن بە یاسا گشتییەکان هەروەك چۆن ڕ ی داوە لە زانستی سروشتیدا.

**٢-ئامانجی زانست:**

بانگەزاز لە لایەن ئەیلەسوفانی مێژووەوە بۆ ناسینی ئامانجی زانست بەرامبەر ئەوەی کە ئارمانجی مێژوویی دیاری بکرێت کە وەڵامدانەوەیە لەگەڵ تایبەتمەندیە بابەتیەکاندا، ئامانجی زانست ئارمانجێکی برگماتی کرداریە لە سروشتدا، ئەویش خستنە خزمەتی سروشت بۆ بەرژەوەندی مروڤ، بەلام لە مێژوودا ئارمانج ئەوەیە کە دەستور بە مروڤ ببەخشرێت بۆ ئەوەی مانای ڕووداوەکانی ئێستا لەبەر ڕۆشنایی پسپۆڕی ڕابردوودا تێبگات تەنانەت ڕۆشنایی بخاتە سەر داوارۆژیش.

**٣-سەربەخۆیی زانست لە دین:**

بانگەوازێکە کە پەیرەوی زانست دەیکات لەو بوارەدا، ئارمانجی زانست لە لاهوت جیابوونەوەیە، ئەمەش کاریگەری کردە سەر مێژوو، مێژوونوسان تیۆری کۆتایی بوونیان دوورخستەوە کەوا لە ئارمانجی مێژوو دەکات لە دەرەوەی چوارچێوەی جیهان بێت.

واتە لە جیهانەکەی تردا، ئارمانجی ڕەوتی مێژوو وای لێهات چووە چوارچێوەی جیهانی ئێستا، هەروەها مێژوو بووە نوێنەری کردەوەی مروڤەکان نەك بۆ هێزە غەیبیەکان، (بیکون) کاریگەری هەبوو لە لایەن پەیرەوکەرانیەوە، هەروەها (جون لوك) و (داڤید هیوم) لە لایەن بنەما فەلسەفەیەکەی بۆ سروشت و مێژوو کاریگەریان هەبوو ئەمەش وای کرد

کە نزعەی سروشتی لە مێژوودا کە خاوەن پێشکەوتنی زانستی لەگەڵ دەسەڵاتی دیندا پێک دابدات، بە تایبەتی لەلای (لوثر) و (کالڤن) کەواتە دەبوایە ئەو پێکدادانە دروست بوایە لەنێوان زانستی نوێ و دەسەڵاتی دیندا، ئەو ڕەوتە زانستییانەی کە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان هێنایانە بەرباس لەم چەند خاڵانەدا کۆدەبنەوە:

١-نزعەی ڕەخنە کە سەردەمی ڕۆشنگەری گرتەوە وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر دەسەڵاتی دین، ڕەوتی ڕەخنە بەرگێکی توندوتیژی پێوە دیاربوو تا گەیشتە هەوڵدان بۆ ڕووداوە مێژووییەکان کە لە پەڕاوی پیرۆزدا هەن بەر ڕەخنە بکەون،

٢-نزعەی مرۆڤایەتی کە مرۆڤی بەرزکردەوە ئەویش دوای ئەوەی کە ڕزگاری بوو لە دەسەڵاتی دین کە بە کەم دای دەناو لە هەمان کاتدا دەیکردە جێگری بۆ گوناهەکانی پیشووی. کردەوەکانی مرۆڤ بوونە بابەتی مێژوو بێ بەرچاوی لە هەڵسەنگاندنی دینی بۆ ئەو کردەوانە هەروەها هێزی غەیبانیش دوورخرایەوە لە پاوان کردنی ڕەوتی مێژوو، ڕێبازی وضعی (ئەوگست کونت) کاریگەری لەسەر مێژوو هەبوو، ڕێبازی وضعی لە لێکۆڵینە ~~مێژوییەکاندا دەرکەوت~~ بەڵام ~~(کانت)~~ هەمیشە لێک دابڕانی دەکرد لە نێوان زانستی سروشتی و زانستی مرۆیی، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم جیاوازیە دیارە لە نێوان جیهانی سروشتدا کە حەتمیەت و سیستەمی پێوە دیارە یان لە نێوان جیهانی

مرۆیی کە ئەوەیش سەربەستی و لە ناکاوەکی پێوە دیارە لەسەر سروشتەوە ئێستاتیک جێگرە بەڵام لە مێژوودا دینامیکی پێشکەوتووە، بەڵام بە پێشکەوتنی تیۆری (داروین) ئەو تەنگ و چەڵەمانەی چارەسەر کرد تەنها ماوەی نێوان جیهانی سروشت و مرۆڤی تەسک کردەوە، لەبەر ئەوەی زانستی زیندەوەرزانی بازنەیەکی نێوەندە لە نێوان زانستی سروشتی پوختە وەك سروشت و کیمیا، هەروەها لە نێوان زانستی مرۆڤایەتی وەك مێژوو و سۆسیۆلۆژی. (داریون) ئارمانجی ئەوە بوو کە فەلسەفەیەکی پێشکەوتنی گشتی دروست بکات کە سنوری راڤەی جیهانی ئاژەڵ بۆ مرۆڤ بشکێنێ بەوەش نەزعەی سروشتی چووە نێو لێکۆڵینە مێژوویی‌یەکان ئەویش نەزعەیەکە کە نوێنەری کاریگەری پەیرەوی زانستی سروشتی‌یە لەسەر مێژوو، ئەو شێوە نەزعەیە وای کرد کە مێژوو ببێتە زانست بە مانای فیزیکی بۆ زاسنت،

١-پەیرەوی ئەزمونی تێخوێدن کە ناراستەوخۆ بێ لە حاڵەتی مێژوودا.

٢-کۆکردنەوەی کەرەستەی مێژوویی تیایدا کە بەرهەمێکی زۆرە لە وردەکاریە مێژوویی‌یەکاندا.

٣-گەیشتن بە دەستووری هەموو تا بتوانرێ قازانجی لێ بکرێ لە ئێستاو رابردوودا.

سەردەمی رۆشنگەری سەردەمی نەزعەی سروشتی بوو لە مێژوودا سەدەی هەژدەهەم لە دوو شێوازدا خۆی دەرخست.

یەکەم/ ڕۆحی ڕەخنەیی کە چووە نێو دیکۆمێنت و مستنداتەکان کە ئەمەش پیرۆزی بە دەق نەدەدا هەر بۆیە ئەو سەردەمە متمانە درایەوە بە ئەپستمۆلۆژی مێژوویی ئەو کاتەی کە مێژوو گەیشتە خۆی (فەیلەسوفێکی وەك دیکارت دەستوریان سەپاند بەسەردا کە چیرۆکەکانی متمانەی تیادا نیەو قازانجی ئێمەی تیادا نیەو مێژوونوسان بە لێڵ کردنی ڕابردوو فێربوون و ئەمرییەکی یەکجار گەورەی پێ دەدەن).

دووەم: بایەخ دان بە لایەنی شارستانی، مێژو هەرئەوە نەبوو ژیانی کەسان بێت یان مێژووی کردەوەکان و جەنگەکانیان بێت، بە ڕای (ڤۆلتێر) زانستخوازی وەك نیوتن (باشترین ڕۆڵی بینی لە پێشکەوتنی ئاوەزی بەشەریەتدا وەك لە پیاوانی سیاسەت و جەنگدا وەك ئەسکەندەرو قەیسەر دیاردەی سیاسەت زۆر بایەخی پێ نەدرا لە لایەن مێژووەوە بەڵکو چالاکی بەشەری کە نوێنەر بوون لە شارستانیەتی نەتەوەکاندا ئەویش واتە هەر ئەویش گوزارش بوو لەو کەسایتییەی هەروەك مونتسکیو دەیبینی).

# پرۆژەی لێکۆڵینەوەی مێژوو لای هیگل

هیگڵ بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژوو پرۆژەیەکی دانا کە بەسێ ڕێگا دیاریان دەکات:

١-مێژووی سەرچاوە

٢-مێژووی تیۆری

٣-مێژووی فەلسەفە

١-مێژووی سەرچاوە:

بۆ ئەوەی شێوازێکمان لە بەردەمدا بێت تەنها دوو ناو دەهێنینەوە وەك هیرۆدۆت (Herodotus) و (ثوکیدیدز Thucy Dides) بۆ ئەو چینە دەگەڕێتەوە، مێژوونوسانی تر هەن کەبەو شێوازە ڕووداوەکانیان یان باری کۆمەڵ کە لە بەرچاویاندا بووەو هاوبەشیان دەکرد لە ڕۆحی ئەو ڕۆژگارەو لیکۆڵینەوەیان لەسەر کردوون کە بە شێوەیەکی ئاسایی هەرچی ڕووداوێکی جیهان هەبوو لە دەوروبەریاندا نووسیویانەتەوە،

وەك مێژوو، بۆ جیهانی نوێنەری ئاوەز، هەر ئەو شێوەو ڕێگایەشە کە شاعیر لەگەڵ ئەو ماددەیەی کە سۆزو هەستەکانی پێی دەدەن مامەڵە دەکات کە لە شێوەی وێنەیەکدا دەری دەخات بۆ بەردەم فریشتەی وێنەکان، ڕاستە ئەو مێژوونوسە سەرچاوانە جۆرە پیاهەڵدانێکی تایبەتیان لەژێردەستایە بۆ ڕووداوەکان، هەروەك چۆن چیرۆکی کەسانی تر دەزانن واتە هەر کەسێك بە تەنها ناتوانێ هەموو شتێ ببینێ یان گوێی لە هەموو شتێ ببێ بەڵام ئەو شێوەیەش بەکارناهێنن کە شاعیرێك بەکاری دەهێنێ وەك کەلتوری زمانی کە قەرزاری زۆریەتی، واتە بەو شێوەیە پیادا هەڵدەدەن کە یەکێکە لە پێکهاتەکان، مێژوونوسان توخمە بەسەرچوەکان لە چیرۆکەکاندا بە یەکترییەوە گرێ دەدەن و پێی دەڵێن (پەرستگای میفومین Mnemeyn)[1] تا ئەمری بەدەست بهێنێ، ئەو شێوە مێژووە (مێژووی سەرچاوە)یە، کەواتە دەبێ ئەفسانەو چیرۆکە شیعریەکان و فۆلکلۆرە میللی‌یەکان دووربخرێنەوە چونکە ئەوانە وێنەیەکی تەم و مژاوی لێڵن لە تێگەیشتنی مێژوو دوایش ئەوانە هی ئەو میللەتانەن کە هوشیاریان بێدار نەبۆتەوە. نمونەی‌ئەو مێژوونووسە سەرچاوانە ڕووداو و کارەکان و دەنگ‌و باسی کۆمەڵ (کە دەیناسن) دەیکەنە بابەتێك لەبەردەم فریشتەی وێنەداردا، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی

---

[1] میفومین: خوداوەندێکە لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا کچی (ئەورانس)ەو دایکی فێرکەری هونەرەکانە.

ئەو چیرۆکانەی دروستی دەکەن گشتی نیە بۆیان ئەویش لە پێوانەکەیدا، دەتوانین (هیرۆدۆت و ثوکیدیدز و جوشار دینی) وەك نمونەیك بهێنینە پێشچاو لەو دەستەیە، ئێستای زیندوو لە دەورووبەرداو لە دەورووبەریاندا مادەی ڕاستەوخۆیە، کە بەکاری دەهێنن، هەروەها ئەو کاریگەریانەی کە نوسەر کردیە ڕووداوەکان واتە مادەی چیرۆکەکەی پێ دروست دەکات واتە هەر ئەو کاریگەریانەن ڕۆحی نوسەریش ڕۆحی ئەو ڕوداوانەیە کە دەینوسێتەوە ئەو پیاهەڵدانە بەرچاویەك دەکات کە خۆی هاریکاری تێدا کردووە، یان یەکێك بووە لە وانەی بایەخی پێداوە، ئەو کەرەستانەی کەوێنە گشتی یەکەی لێ دروست دەکات ماوەیەکی کورتە لە زەمانێکدا، کە چوارچێوەی کەس و ڕووداوی خەڵکانی تێدایە، مەبەستی مێژوونوس تەنها دەرخستنی ڕووداوەکانە لە بەردەم ئەوەی نوێدا، کە هەموو ڕووداوەکان هەمان ڕوونی پێوە دیار بێت ئەویش بەهۆی ئەو سەرنجانەو ئەو چیرۆکە زیندوانەی کە خۆی گوێی لێبوون یان گوێ بیستیان بوە، بەلام تێڕامانە تیۆرەکان لە پسپۆری ئەودا نین لەبەرئەوەی لە ڕۆحی بابەتەکەیدا دەژی (یان ڕوداوەکاندا دەژی) بێ ئەوەی بازبدات بەسەریاندا، تەنانەت پلەیەکی وەك (قەیسەر)یشی هەبێت لە سەرکردایەتیدا یان یەکێ بێ لە پیاوانی دەوڵەت ئەوا گەیشتنی بە ئارمانجی تایبەتی خۆی مێژوو پێك دەهێنێ لە دیدی خۆیەوە، دەتوانین بلێین لەو شێوە مێژوونوسانە وێنەیەکی

هزریمان پێ نابەخشن، خەڵکان و گەلان لە نوسینەکانیاندا بە وێنەی بوویەری خۆیان دەردەکەون ئەو قسەیەش وێك ناچن لەگەڵ ئەو گوتارانەی کە لەلای ثوکیدیدز دەیبینین، ناتوانین یەقینێك پەیدا بکەین کە گوتارێك پێشووتر وترابێت، پێویستە کە دانی پیادا بنێین کە گوتار کارێکی ڕاستەقینەیە لە جیهانی بەشەریدا، بە ڕاستیش کارێکی کاریگەرەو زۆریش کاریگەرە، ڕاستە هەندێ کەس دەڵێن ئەو مەسەلانە یان هی تر تەنها قسەیەو ئەوانەش رای دادەنێن کە ئەوە زیانی نییە قسەش جیاوازیەکی گرنگی هەیە کە هیچ زیانێکی نیە بەڵام ئەو قسانەی کە لە گەلێکەوە ڕووەو گەلێکی تر دەچێت یان ئەو گوتارانەی کەبەرەو ڕووی نەتەوەو پادشاکان دەکرێنەوە پێك هێنەرە بنچینەکانن لە مێژوودا، ئەگەر باوەڕمان هێنا بە گوتاری لە گوتارەکانی (بیرکلیس Percles) کە قسەی پیاوانی دەوڵەتە کە بلیمەتی پێوە دیارە لە ڕۆشبنیری و ڕەسەنایەتدا، لە قسەکاندا پیاوانی مێژوونوس گوزارش لە قسە کاریگەرەکان دەکەن کە هاوڵاتیانیان پێی دەدوان کە کەسایەتیانی پێك دەهێنا، هەروەها ئەو ڕایانەیان تۆمار دەکرد کە پەیوەندی سیاسیان دیاری دەکرد، هەروەها سروشتی ئاکارو ڕۆحیان و هەڵس و کەوت و ئارمانجیان، مێژوونوسەکان لەسەر زاری خەڵکان شتیان دەنوسی شێواندنێکی هزری پێوە دیارنەبوو بەڵکو کۆپیەکی هاوشێوە بوو کە نەشێوێنرا بوو لە نەریت و ئاوەزو دروست بوونیان، هەندێ لە

مێژوونوسان هەیە دەبێ لە بەرامبەریاندا زۆر ڕاوەستین، ئەمەش گەر بمانەوێ لەو نەتەوانە بدوێین کە لێی دەدوێین، ئەوانەشی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین لە لاپەڕەکانیاندا نەك بۆ مەبەستی ڕۆشنبیری بەڵکو تا بتوانین خۆشی قوڵی بنەچەیی بەدەست بهێنین، کە پێشتر ناویان هێنرا (هیرۆدۆت) باوکی مێژوو واتەی داهێنەری مێژوو، کتێبی (اکسینوفون Xenophon)[٢] کە بەنرخترین داهێنەری مێژوو دادەنرێ، بە کتێبی سەرچاوە دادەنرێ، هەروەها (شروح)ی قەیسەر کە کارێکی بلیمەتانەی عەقڵێکی بەهێزە، مێژوونوسانی (حولیات) کە بە پیاوانی سەردەمی کۆن دەژمێردرێن و سەرکردەی بلیمەت و پیاوانی دەوڵەت بوون، بەڵام لە سەدەی ناونجیدا گەر (ئەسقەفەکانی Bishops) لێ جودا بکەینەوە، کە جێگایەکی گرنگیان داگیرکرد لە جیهانی سیاسیدا، بەڵام ڕەهبانەکان (Monks) ئەو شێوازەیان داگیرکرد لە نوسینی مێژوودا بە شێوەی کە نوسەرانی (حولیات)ی کرچ و کاڵ بوون، هەروەها گۆشەگیر بوون واتە دووربوون لە ژیانی ڕۆژانە، بەڵام مێژوونوسانی کۆن پەیوەندیان بە ژیانی ڕۆژانەوە هەبوو، بەڵام لە سەردەمی نوێدا پەیوەندیەکان گۆڕان لەبەرئەوەی ڕۆشنبیریمان بەرین و گشتی‌یە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەگۆڕێ بۆ ئەو ڕووداوانەی کە دەبنە نموونە بۆ مێژوو.

---

[٢] اسکینفون/ زەینفون: کتێبی گەڕانەوەی دە هەزار جەنگاوەر.

٢-<u>مێژووی تیۆری:</u>

بەو ڕێگایەدا دەڕوات کە خۆی ناخن ناکاتە سنووری سەردەم کە باسی لێوە دەکات، بەڵکو سنووری ڕۆحی سەدەی ئێستا تێدەپەڕێنێ، جیاوازی ئەو شێوە مێژووە لەم چوار شێوەیەدا بەدی دەکرێ:

یەکەم: ئارمانجی لێکۆڵینەوە دەیەوێت بگات بە هەموو خەونێك بۆ هەموو مێژوویەك کە تایبەت بە گەلێك لە وڵاتێکدا بن، کە پێی دەڵێن مێژووی گشتی، لەم بارەشدا کاری سەرەکی چارەسەرکردنی مادەی مێژوویی‌یە لای مێژوونوس کە کارەکەی بە ڕۆحێکی تایبەتی گەوار دەکات، بە ڕۆحێکی تایبەت کە ڕۆحێکی جیاوازە لە ڕۆحی ناوەڕۆك کە چارەسەری دەکات، ئەو شێوازە لە مێژوو بایەخی ئەوەی هەیە کە مێژوونوس ئەو ڕێبازانەی دیاری دەکات و وەسفیان دەکات و نوسەر بۆی دەچێت بۆ کارو ڕووادوەکان، هەروەها ئەو پاڵنەرانەی کە شێوەی چیرۆکەکان دیاری دەکات، ئەمەش بە پشەیەك دەردەخرێ لای ئێمە، لای ئەڵمانەکان، لە شێوەی جیاجیا دەکرێتە خۆ، هەر مێژوونوسێك پەیڕەوێکی تایبەتی خۆی دەگرێ، بەڵام ئینگلیزو فەرەنسیەکان ڕێبازە گشتی‌یەکان بە ئاگاوە دەنوسن لە نوسینی مێژووداو هەروەها ڕای خۆیان دەردەبڕن کە زۆربەی ڕای ڕۆشنبیری و نەتەوەیی‌یە، بەڵام لای ئێمە هەر کەسێك کاردەکات بۆ داهێنانەکانی ڕای تاکەکەسی خۆی، بێ ئەوەی مێژووبنوسێ هەمیشە وامان دەبینن، خۆمان بە ئاشکرا کردنی

چۆنایەتی‌یە وە خەریك دەكەین كە پێویستە مێژووی پێ بنوسرێ، ئەم شێوە مێـژ.وە تیۆریـە نزیکـە لـە مێـژووی سـەرچاوە کـاتێك مەبەسـتی مێژوونوسر, هـەر ئەوەیـە کـە دەنـگ و باسـە مێژوویـی وڵاتـێ لـە وڵاتـان پیشان بدات.

لـەو شێوە ڕۆڵنـەدا (کـە پێویستە نوسـەرانی لێ بەدەرنەکەین وەك (لیڤـی Livy) و (دیدور الصقیلی) و (مێژووی سویسرا)ی (یوهـانس فون مولـر) كە دەبێ هەموو ڕێزێکی پێ بدرێ، دەتوانین نووسەرانی دەنگ و باس کە نزیکن لـە نوسـەرانی شـێوەی یەکـەم کـە باشـترین نوێنـەری ئـەو شـێوە نوسینەن، ئـەوان بـە شـێوەیەك دەنوسـن بـە ڕێگایـەکی زۆر ڕاسـتەوخۆ (زیندوو) تەنانەت خوێنەر دەتوانێ وای مەزەنە دەکات کە گوێ لە بەهاو چڕی ڕووادوەکان دەگرێ و شاهدی بەرچاو دەبینێ، بەڵام زۆر جار ئەوە ڕوودەدات کە خودگەرایی کە دەبێ نوسەری پێی هەستێ، کـە سـەر بـە ڕۆشنبیرێکی جیاوازە هاوتـەریب نـابێت لەگـەڵ ڕەوتـی مێژوویـیدا کـە هاوپەیمان نابێت کە دەبێ کاری تۆمارکردنی پێ داپۆشێ، لەبەرئـەوەی ڕۆحی نوسـەر جیـاوازە لـە ڕۆحـی ئـەو سـەردەمەی لێی دەکۆڵێتـەوە بـەو مانایـە (لیڤـی Livy) لەسـەر زاری پادشـاو قنصـل و سـەرکردە ڕۆمانیـە کۆنـەکان گوتـار دەنوسـێ کە کـەس ناتوانـێ بڵێـت تەنها ئـەوان نـەبن کـە بەرگریـەکی تـەواویان لـە ڕۆشـنبیری پێیـە دەربـارەی لیڤـی خـۆی. ئـەو گوتارانە کە گۆشن لەگەڵ فۆلکلۆری بنەچەی سەردەمی ڕۆمای کۆن (وەك

چیرۆکە خورافەکەی دەربارەی مینسیوس ئەگریبا (Meneius Agrippa)[3] لێرەدا لیڤی ئەو ڕێگەیەمان نیشان دەدات که هەمان ڕێگایە کە وەسفی جەنگێك وەك ئەوەی کە خۆی بە ڕاستی بینیویەتی، بەلام سیماو تایبەتی کە وەسفی دەکات بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێ وەك بۆ وەسف کردنی جەنگێك لە سەردەمێکی کۆندا ڕووی دابێت، کاتێ (لیڤی) باسی جەنگی (ڤلسك Volsci)[4] دەکات لە زۆر شوێندا بە شێوەیەکی توند دەڵێ (ئەمسال لەگەڵ ڤلسك جەنگ هەڵگیرسا).

دووەم/ شێوەی دووەم لە مێژووی تیۆریدا دەتوانین پێی بڵێین مێژووی پرگماتی Pragmatical ئەمەش دەبێ ڕابردوو بخوێنینەوەو خۆمان سەرگەرم بکەین بە جیهانێکی دوور لە ئێمە، ئێستاش لە بەردەم هزردا دەبێتە کازیوە دەرەئەنجامی چالاکی تایبەتی‌یە وەك ئەوەی بەخشینی هزر بێت بۆ ئەو هیلاکی‌یەی کە دەیدات لە پێناویدا ڕاستیش ئەوەیە چەند ڕووداوەکان فرەیی و هەمەجۆر بن ئەو هزرەی کە تیایدا دەکوڵێ، واتە ناوەرۆکە قوڵەکەیی و پەیوندیان لەگەڵ یەکتردا. یەکە، ئەمەیش

---

[3] مینیوس ئەگریپا/ پیاوێکی ڕۆمانی بوو لە سالی ٥٠٣ قونسوڵ بوو هەندێك ئەفسانەی دەربارەی دەگێڕنەوە کە پێك هاتنە لە نێوان گشتی و ئەشرافدا لە ڕۆمادا دەربارەی دەڵێن کە چیرۆکی پشت بەستنی ئالوگۆڕی باس دەکرد لە نێوان هەناو (البطن) و ئەندامەکانی لەشی مرۆڤدا.

[4] ڤلسك: گەلی ئیتالی کۆن نیوەی ڕۆژئاوایی یان لە لەتیوم Latium دەژیان ڕۆما لە سالی ٣٢٨ داگیری کردو بون بە هاوولاتی ڕۆمانی.

ڕووداو لە قسەی پێشووی دەردەچێ بەهۆی هێزەوە دەیکاتە ئێستای لەبەرئەوەی تێڕامانە تیۆریە پرگماتی‌یەکان یان ڕێکخراوەکان سەرەڕای ئەوەی بە سروشتیاندا ئەبستکراتن بێ چەندوروچوون، کە تایبەتە بە ئێستاوە کە حولیاتی ڕابردووی مردو بە خاك دەسپێرن.

بەڵام مەسەلەی توانینی ئەم تێڕامانە تیوریانە کە ببێتە جێی سەرنج و بوژاندنەوەی ژیان لە ڕووداوەکاندا بە ڕاستی ئەوە لەسەر ڕۆحی نووسەر دەوەستێ، لێرەدا دەبێ گوزارشتێکی تایبەتی دابنێین بۆ ئەو تێڕامانە تونێریە ئاکاریانە، واتای فێربوونە ئاکاریەکان کە گریمانەی ئەوەی لێ دەکەین لە مێژوودا بیانهێنینە دەرەوە، مێژوو زۆرجار چارەسەری ئەو دەرئەنجامە تێڕامان و ئاکاریانە لە هزری مێژوونوسدا دەکات، دەتوانین بڵێین ئە نموونانە کە بانگەشەی باشی دەکات دەروون ڕێك دەخات، کەچی چارەنووسی گەلان و دەوڵەتان و بەرژەوەندیەکانیان و پەیوەندیەکانیان و ڕیسی مەسەلە ئالۆزەکانیان مەیدانێکی تر لە بەردەممانمدا دەنوێنن کە جیاوازترە لەوی تر، دەسەڵاتداران و سیاسەتمەداران و نەتەوەکان بە یەقینی داوایان لێکراوە کە زانستەکان بخوێننەوە کە پسپۆڕان و ئەزموونەکان پێشکەشیان دەکەن لە بواری مێژوودا، بەڵام ئەزمون و مێژوو فێرمان دەکەن کە گەلان و حکومەتەکان هیچ شتێ لە مێژووەوە فێرنەبوون، بەپێی ڕێبازەکانی پاڵپشت فێرنەبوون، هەموو سەردەمێك جووت دەبن لەگەڵ بارودۆخی تایبەتیدا،

(یوهـانس فـون مولـر) لـه مێشـکیدا ئـەو ئارمانجـە ئاکاریانـەی لـە نوسینەکانیدا دەردەخسـت بـە تایبـەتی لـە کتێبـی (مێـژووی جیهانی) هەروەها لە کتێبی (مێژووی سویسرا)دا ئارمـانجی لەوەدا ئەوە بوو کە کۆمـەڵێك تیـۆری سیاسـی دابنـێ بۆ ڕۆشـنبیرکردنی پادشاو حکومـەت و گەلان و ڕێکخستنیان بوو، (بەشێکی تایبەت لـە تیـۆرو هزرەکانی دانا) بـەڵام ئەوە هـەموو باشـەکانی نەبوو کـە کـردی، بـەڵام دیدێکـی گشـتی و وردو سـەربەخۆ بـوو بـۆ پەیوەندیـەکانی مێـژوو (وەك لای مونتسـیکیو دەیبینین لە کتێبی ڕۆحی یاساکان) تەنها ئەوە بایـەخی ڕاستەقینەی هـەبوو لـە نموونـەی ئـەو ڕەنگـە لـە تێڕامـانی تیۆریـدا، لەبەرئـەوەی هـەر ڕەنگێك لە مێژووی تیۆری ڕەنگێکی تر دەسڕێتەوە، کەرەستەکان نەرمن و مل کەچن لە بەردەم هەموو نوسەرێدا، هـەموو نوسـەرێکیش وا دەزانێ لە دەروونی خۆیدا دەتوانێت چارەسەری ئەو کەرەستانە بکات و ڕیزیـان بکات، وای دەبینین کە هـەر یـەکێکیان پـێ دادەگـرن لەسـەر ئـەوەی کـە ڕۆحـی تایبەتیان ڕۆحـی ئـەو سـەردەمەیە کـە لێی دەکۆڵێتـەوە، زۆرتریـن خوێندەریش بۆ مێژووی تیـۆری مـەیلیان بـەلایاندا دەچـێ، هـەر بۆیـە دەیانبینین دەگەڕێنـەوە بۆ ئـەو مێـژووەی کـە ڕای تایبـەتی تیـادا نیـە، بێگومـان دیـارە ئـەو مێـژووە بایـەخی خـۆی هەیـە، بـەڵام هیچمـان پـێ نابەخشـێ تەنها کەرەستەی مێژوو نەبێت، ئەمەشە کە ئێمـەی ئـەڵمانی پـێی ڕازیـن، بـــەڵام فەرەنسـیەکان توانایـەکی بلیمەتانـەیان هەیـە بـۆ

بوژاندنــەوەی ژیــانی نــوێ لــە ســەردەمە ڕابردووەکانــەوە، هــەروەها بەستنەوە لە نێوان ڕابردوو بارودۆخی ئێستادا.

٣-شێوەی سێهەم لە مێژووی تیۆری (مێژووی ڕەخنەیی)یە، نەبێ ئەوە بڵێین کە ئێستا لـە ئەڵمانیادا شێوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویـی باوە وەك لەوانی تر، ئەم ڕێگەیەش خودی مێژوومان بۆ پەخش ناکات هەر بۆیە باشتر وایە ناوی لێ بنێین مێژووی مێژوو، لەبەرئەوەی ڕەخنەی چیرۆکە مێژوویــەکان لێکۆڵینەوەیــە لــە ڕاســتی و ماقوڵیــەکان، ســیفەتی دیاریکراو هەروەك ئەوەی بوونەوەرە کە پێویست ناکات ببێت، لە تیژی هزریـدا کـە نوسـەر دڵـی پـێ خـۆش دەبێـت کـە وای لێ دەکـات لـەو دیکۆمێنتانـە شـت دادڕێ کـە لـە کەرەسـتە تۆمـار کراوەکـاندا نـەبێت، فەرەنسیەکان ئەو شێوەیەیان پێشکەش کردین واتـە ئـەو نوسـراوانەیان پێشکەش کردین زۆر لە کارەکانیان کۆدەبێتەوە لە نێوان تیۆری ڕاستی و قوڵدا، بەڵام هەوڵیان نەدا کە تەنها کارێکی ڕەخنـەیی بێت وەك ئـەوەی مێژویـەکی ڕاستەقینە بێت بەڵکو دەسـەڵاتدارەکانیان لـە وێنـە پشکنینە ڕەخنەییەکاندا نیشـاندا، بەڵام بەسـەر بـواری فقـهی زمـاندا هـەروەها بەشێك لە نوسینەوەی مێژوومانی داگیرکرد، ئەم ڕەخنە (باڵا)یە دەستێك بوو بۆ بەرەوپێشەوە چوونی هەموو شێواندنی دژایەتییەکان بۆ مێژوو، کە خەیاڵی پەرت سروشتی پێدەکات، لێرەدا پرۆسەیەکی ترمان بەوەی کـە تێڕامانـە خودیـەکان بکەینــە جـێی پــێدەرە مێژوویـیــەکان ئــەو

تێرامانانەی بەهاکەی ئەوەندەی بەشەکانی پێوانە دەکرێ، مەبەستم کەمی ڕووداوە بەشەکان کە پێی هەڵدەسێ، هەروەها برانەوەی تەواو کە زۆرینەی دیکۆمێنتە مێژوویی‌یەکان دژایەتی یەقینی دەکەن.

٤-دواشێوە لە مێژوی تیۆریدا هەر لە سەرەتاوە خۆی ئاشکرا دەکات لە سروشتی بەشەکەی کە هەڵوێستێکی ئەبستکراتی وەردەگرێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قۆناغێکی گوێزانەوە لەخۆ دەگرێ بۆ مێژووی فەلسەفی جیهانی، مادامەك ڕا گشتی هەڵدەگرێ (بۆ نموونە لە مێژوی یاساو مێژووی دین) ئەو شێوەیە گەشەی کرد لە مێژووی هزردا لە سەردەمی ئێمەدا بەرەو پێشەوە دەچوو تا وای لێهات بەبلیمەتی ناوی دەرکرد، ئەم لقانە لە ژیانی نەتەوەییدا پەیوست دەبن بە پێکهاتە تەواوەکان لە (حولیات)ی گەلدا، ئەو پرسیارەی کە بایەخی زۆری هەبێ ئەویش کە پەیوەندی هەیە بە بابەتەکەمانەوە ئەوەیە ئایا هەموو پەیوەندیدار دەبن کە دووچاری ڕاستی و بوویەرەکەی دەبێتەوە، یان ئەم پەیوەندیە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیە دەرەکیەکان؟؛ لەوحاڵەتەی دوایی‌یەدا دیارە، ئەم دیاردانە بایەخیان هەیە (هونەر/ یاسا/ دین.. هتد) لەبەرئەوەی تایبەتمەندی نەتەوەیی‌یە دووچاری گەلان دەبێ، دەبی ئاگاداری ئەوە بین کاتێك مێژووی تیۆری دەکاتە دەست تێکەڵاوکردن لەگەڵ ڕایە گشتی‌یەکاندا ئەم ڕایانە ئەگەر هەڵوێستیان باش بێت ئەوە هێڵێکی دەرەکی وەرناگرێ یان پلەپلەیەکی ڕووکەشی بەڵکو ڕۆحی ناوەوەی

ئاراستەكراوە: بۆ ڕووداو و هەڵسوكەوتەكان كە (حوليات)ەكانی نەتەوەیەك لە نەتەوەكان ئیشی پێ دەكەن، هەروەها لەبەرئەوەی لە ڕاستیدا هزر سەركردەی گەلان و سەركردەی جیهانە وەك ئەستێرەی (عەتارد ڕێنیشاندەری ڕۆح)ە هەروەها ڕۆح یان ئیرادەی ئاوەزی كە پێویست بووە بۆ ئەو ڕێنیشاندەرە، كە ئاراستەكەر بووەو تا ئێستاش ئاراستەكەری ڕووداوەكانە لە مێژووی جیهاندا، هەر بۆیە ئارمانجی لێكۆڵینەوەی ئێستامان ئەوەیە كە ئەو ڕۆحە بزانین چییەو وەزیفە ڕێنیشاندەرەكانی چین كە ئەمەیش دەمانبات بۆ:

شێوەی سێهەم لە مێژوو كە مێژووی فەلسەفییە، ئاگاداری ئەوە بین كە پێویست نەبوو بۆ ڕاڤەكردنی ئەو دوو جۆرەی پێشوو لە نوسینی مێژوودا لەبەرئەوەی سروشتیان دیاربوو، بەڵام مەسەلەكە لەم شێوەیەدا جیاوازترە كە بێگومان پێویستی بەو ڕوونكردنەوە یان پاساودان هەیە، بەڵام باشترین پێناسەكردن بۆی ئەوەیە كە فەلسەفەی مێژوو هیچ شتێ ناگەیەنێ تەنها ئەوە نەبێ كە لێكۆڵینەوەی مێژووە لە دیدگای هزرەوە، ڕاستیش ئەوەیە كە هزر ناوەڕۆكە بۆ مرۆڤ كە لە ئاژەڵی جودا دەكاتەوە، هزر توخمێكی پێویستە كە بەهەستەوە گرێدراوە هەروەها بە زانست و زیرەكی و ئیرادەو ڕەمەكیمانەوە، جەخت كردن لەسەر هزر كە لێی دەدوێین دەربارەی مێژووی باوەڕ پێنەكەر وا دەردەكەوێ كە هزر لە زانستی مێژوودا دەبێ ماڵی ئەو پێدەرە بێت، واتە بەشێك دەبێت لە

ڕاستیو بوویەرەکان کە بنچینەو ڕێنیشاندەرمکەیەتی، لە لایەکی تـرەوە کە فەلسـەفە لایـەنگرە بـۆ ناوچـەی ئـەو هـزرەی کـە خـۆ بەرهـەم دێنـێ بێئەوەی ئامازە بە بوویەری کرداری خۆی بکات، ئا بەو شـێوەیە کـە هزری تیۆری لـە مێژوو نزیـك دەبێتـەوە کە لەسـەر ئەو شێوازە بێلایـەن دەبێ، لە وانەیە وای بۆ بچین کە چارەسەرێکە بۆیەوەك بەو سیفەتەی کە مادەیـەکی نێگەتیڤـە، بـەدەر لـەوەی کـە ئـەو مادەیـە بـەجێ بـهێڵێ لـە ڕاستییە سەرچاوەکەیدا، ناچاری دەکات کە لەگەڵ هـزری زاڵ بوونـدا هاوکێشە بێت، کـە بـە ڕێگایـەکی قەبـەل (apricri) ڕاڤـەی بکـات، کـاری مێژوو کورت دەکرێتەوە لەوەی لە نێوان دیکۆمێنتەکاندا کە ئێستا هـەن و لـەوەی کـە هـەبوون لـە پێشـوودا لـە کـردەوەو کـارە پراکتیـەکانیدا، ڕەوڕەوەی فەلسەفە کە فەلسەفە لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێ کە لە مێژوو رادەمێنێ، هزرێکی سادەیە دەربارەی ئاوەز کە دەڵێ: ئاوەز زاڵ دەبێ بەسەر جیهاندا، مێژووی جیهانیش شێوەی ڕەوڕەوەی ئاوەزی دەبێ لە بەردەمماندا، ئەم هەست پێکردن و قەناعەت هێنانە تەنها داسەپینە لە بواری مێژوودا وەك ئەوەی مێژوو بەلام زۆرێك نیە لە بواری فەلسـەفەدا، لـە فەلسـەفەدا بەڵگە هەیە لە ڕێی ئەپستمۆلۆژی تیۆرییەوە کە ئـاوەز ناوەرۆکـە هـەروەها هـێزێکی ناکۆتاییـیـە خـۆی لـە خۆیـدا، لەوانەیـە ناوەڕۆکی ناکۆتـایی لـە پشـت هـەموو ژیـانێکی سروشـتی و ڕۆحییـەوە سـەردەردەهێنێ هـەروەك چۆن وێنـەی ناکۆتـایی پێـك دەهێنـێ کـە ئـەو

ناوەرۆک دەبزوێنێ، لە لایەکەوە ئاوەز ناوەرۆکی گەردوونە کەچی تێدایە لە بوونی هەموو بوویەرێکی ڕاستی و هەروەها مانەوەی، لە لایەکی ترەوە وزەی ناکۆتایی یە بۆ گەردوون، مادامەکی ئاوەز لە لاوازیی دا نیە کە نەتوانێت شتێك بەرهەم بهێنێ تەنها نموونەی بالایی یان گەر نیەتی هەبێ، کە شوێنەکەی لە دەرەوەی بوویەردا دەستگیر دەکات، لە ناوچەیەکدا کە کەس نازانێ ئەوە تەنها دەبێتە شتێکی جیابونەوە، لە سەری هەندێ مرۆڤدا هەیە بەلام بەلەمی ناکۆتایی نیە بۆ شتەکان، ئەو ماهیەتەکانیەتی و ڕاستە تەواوەکانیەتی، کەرەستەی تایبەتی یەتی کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات لە گەشەی ئەرێنیی تایبەتدا، مادامەکی وەك کردارە دژایەتی یەکان پێویبستی بە مەرجی کەرەستە دەرەکیەکان نیە بۆ بابەتەکانی گەشەی (ئاوەز- عقل) خۆی خواردنی تایبەت بۆ خۆی دروست دەکات کە خۆی بابەتی کردارەکانیەتی لەسەر ئەوەش کە یەکەیەکی بوون و ئارمانجی ناکۆتایی ڕەهایە، هەروەها ئەو هێزە گەشەیە کە ئەو ئامانجە دەپێکێ و پێشی دەخات، تەنها لە دیاردە جیهانی سروشتی یەکاندا نیە بەڵکو لە جیهانی ڕۆحیشدا، مەبەستم مێژووی گشتی یە بەلام ئەم (هزر)ە یان ئەو (ئاوەز)ە کە (الحق) (ئەمرە) کە ماهیەتێکی بەهێزی ڕەهایەو خۆی لە جیهاندا ئاشکرا دەخات لەم جیهانەشدا هیچ شتێ ئاشکرا نابێت تەنها ئەو نەبێت، مەبەستم ئەم ئاوەزو شکۆمەند و بلیمەتی یەیەتی، ئەو

بانگەشانەیە کە فەلسەفە بەڵگەی بۆ هێنایەوە، دەبێ بڕوایەکی پتەومان هەبێ بەوەی کە ئاوەز (عقل) لەمێژوودا هەیەو جیهانی ئاوەز ئیرادەی هوشیار لە ناکاوەکی نیە، بەلام دەبێ لەنێو تیشکی هزری هوشیاریدا بدرەوشێتەوە، ئەو مێژووەی کە لێی دەکۆڵینەوە شێوەی ئاوەزی پێویست بوون بۆ ڕۆحی جیهان دەگرێتە بەر، ئەو ڕۆحەی کە سروشتی وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەگەر خۆی ئاشکرا بکات لەو سروشتە تاکەی لە دیاردەکانی جیهاندا، هەر دەبێ ئەوە دەرکەوێ، وەك ئەوەی ئاکامی کۆتایی بێت بۆ مێژوو؛ بەلام دەبێ مێژوو وا سەیری بکەین وەك خۆیی و ئێمەش بە ڕێگایەکی مێژوویانە بڕۆین، مەبەست ڕێگای ئەزموونگەری وە پێویستە لە سەرمان کە ئاگامان لەو مێژوونوسانە بێت کە ڕێمان لێ هەڵە دەکەن (بە تایبەت لەنێو ئەڵمانیەکان)دا ئەوانەی خاوەن دەسەلاتێکی گەورەن، ئەوانەی کە فەیلەسوفان تاوانبار دەکەن، مەبەستم ئەوانەی داهێنەری قەبەلیەتن لە داهێنانی دیکۆمێنتە ڕابردووەکان، بۆ نموونە چیرۆکێکی خورافی هەیە کە بلاوبوتەوە دەربارەی گەلێکی سەرەتایی بە ڕەگەز کە لەڕێی خوداوە ڕاستەوخۆ فێربوون خودا بینینی تەواوی پێ بەخشین هەروەها حیکمەت و زانستی پێ بەخشین بە هەموو یاسا سروشتی و ڕاستی و ڕۆحیەکانەوە، گەلێکی تریش هەبوو لە گەلانی (کهنوتیە) دەتوانین بەشێك لە نموونەیەك بهێنینەوە:

هەندێ لە داستانە ڕۆمانیەکان هەبوون کە مێژوونوسانی ڕۆمانی مێژووی یەکەمیان پێ دروست کرد بۆ شارەکەیان.. هتد، ئەو شێوەیە لە سەرچاوەکان بۆ ئەو مێژوونوسە بەهرەمەندانە بەجێدەهێڵێن کە بەکاری دەهێنن (لە ئەڵمانیادا) ئەوەیە: کە پێویستە لە سەرمان کە بە ئەمانەتەوە هەر شتێك مێژوویی بێ لە ئامێزی بگرین. ئەوەی بە چاوی هزرەوە سەیری جیهان دەکات، جیهانیش لە ڕێی خۆیەوە بەرگێکی ئاوەزی دەکاتەبەری لە بەردەمیدا، پەیوەندییەکان ئاڵ و گۆڕن یان بەکارهێنانی جۆراوجۆر بۆ هزر، یان ڕاجیاوازەکان، دەتوانم لە دوو ڕادا دەربارەی ئەوەی کەوتراوە کە ئاوەز جیهان بەڕێوە دەباتو تا ئێستاش بەڕێوەی دەبات کە دوایش مێژووی جیهان بەڕێوە دەبات کە لە خوارەوە شی دەکەمەوە:

١-ڕای یەکەم/ ئەو برگەیەیە لە مێژوودا کە پێمان ڕادەگەیەنێ کە (ئەنکساگوراس Anaxagoras)* ی یۆنانی یەکەم دەڵێ (نوس Nous چەمك) بە شێوەی گشتی یان ئاوەز جیهان بەڕێوە دەبات، لێرەدا مەبەست زیرەکی نیە وەك ئەوەی کە ئاوەز خۆی هوشیار بێت نەخێر ئەو رۆحەشی نیە کە وەك خۆیەتی، دەبێ بە ئاگادارییەوە ئاگاداری ئەو جیاوازیە ببینین لەنێو ئەم و ئەودا، بزوتنەوەی سیستەمی خۆر بە پێی

---

* ئەنکساگوراس: یۆنانییەو یەکەم کەس بوو کە (Nous چەمك)ی یە سیفەتێکی گشتی یان ئاوەز جیهان بەڕێوە دەبات باسی لێوە کرد.

ئەو یاسایانە دەڕوات کە ناگۆڕدرێن. ئەو یاسایانەش ئاوەزی تەواون لەو دیاردانەدا کە لێی دەدوێن بەڵام نە خۆرو نە هەسارەکان کە بە دەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوە بەپێی ئەو یاسایانە دەتوانین پێی بوترێ هوشیاری، (ئەرەستو) دەربارەی (ئەنکساگوراس) دەڵێ (کە ئەو یەکەم کەس بوو لەو هزرە دواوە، ئەو وەك پیاوێکی قورس دەردەکەوێ لەنێو نەتەوەیەکی سەرخۆشدا)، (سوکراتیش) بیرەکەی لە (ئەنکساگوراس)ەوە وەرگرت بە خێرایی ئەو هزرە زاڵ بوو بەسەر فەلسەفەدا بێجگە لە قوتابخانەی (ئەبیقور) کە هەموو ڕووداوەکانی دەگەڕانەوە بۆ ناکاوەکانی (صدفە)، (ئەفلاتون) لەسەر زاری سوکرات دەڵێ (زۆر پەرۆش بووم و سەرم سوڕماو هیوام هەبوو کە مامۆستایەك بدۆزمەوەو بۆم دیاری بکات کە سروشت لەگەڵ ئاوەزدا دەگونجێ، هەموو دیاردە بەشەکان لە ئارمانجی چۆنیەتی و تایبەتیدا بدۆزێتەوە، هەموو بسەلمێنێ کە ئارمانجی بلیمەتدا بۆ گەردوون، بەڵام خۆم زۆر بە دەسەوە نەدا بۆ ئەو هیوایە بەڵام پەرۆشی بێ هیواییم لەوەدا بوو کە گۆشەگیر بووم بەدیار نوسینەکانی ئەنکسا گوراس کە تیایدا دۆزیمەوە پیش ئەوەی بچێت بەلای ئاوەزدا دەچوو بەلای هۆکارە دەرەکیەکاندا وەك /با/ ئاو/ ئاگر/.. هتد، دیارە ئەو هەڵەیەی کە سوکرات گومانی لێدەکات لەسەر ئەو ڕێبازە ناچەسپێ بەڵکو لەسەر پراکتیزەکردنی ئەو ڕێبازە لەسەر سروشتی بەرچاوە، مەبەستی من لەوە: سروشت پێشبینی نییە لەو شێوەیە،

بەڵکو ڕێ زەکە تەنها بە بەهای ئەوەیە کە سروشتی بەرچاو نەبێ، تێگەیشت نە تێگەیشتنێکی ئاوەزیگشتی پەخشدار بێت و لەسەر ئەوەی ک ، جێی پێشکەوتن بێت بۆی، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ڕێکخیستێك بێت کە ئاوەز پێی هەڵدەستێ.
دووەم/ دەبێ ئەوە ئاشکرا بکەین کە دەڵێ (ئاوەز جیهان ئاراستە دەکات ئەمەش لەگەڵ ئەو ڕێبازەدا دەگونجێ کە ئێمە لەسەری دەدوێین لەبەرئەوەی چاودێری خودا کە حیکمەتێکە هێزێکی ئاکۆتایی پێدراوە کە ئامانجەکانی بەجێ بهێنێ مەبەستیشم دابین کردنی ئاوەزی ڕەهایە بۆ جیهان ئاوەزیش ئەو هێزەیە کە خۆی بەربەستی تەواو دادەمەزرێنێ، هیگڵ ڕەخنە لە ڕێبازەکەی سوکرات دەگرێ کە پەیوەندە بە ڕێبازی (ئەنگساگەراس)ەوەو دەڵێ لەبەر ئەوەی ئەو باوەڕە نموونەیەکی دیارو دیاری کراو نیە، کەس ناتوانێ بە شێوەی گشتی پێی بڵێت بەناوی باوەڕ چاودێری خوداوەندەوە بێ ئەوەی ئەوە بسەپێنێ بە ڕەوتی مێژووی هەموو، بەلا/ ڕاڤەکردنی مێژوو واتە وێناندنی هەڵچوونە بەشەریەکان یان ئاشکرا کردنی سوزە مرۆڤەکان و بلیمەتی و هێزی کاریگەری لە ڕۆڵی گەرە دەبینێ لەم شانۆیەدا، ئەو ڕەوتەی کە چاودێری خوداوەند دیاری دەکات کەلەسەر ئەم شانۆیە پیشانی دەدات شێوەیەك دەردەخات پێی دەڵێن (پلان)ی چاودێری خوداوەند، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پلانە کە خۆی دەسەپێنێت وەك ئەوەی شاراوە بێ لە بەردەم چاوماندا، سەرەڕۆیشە

ئەگەر ئارەزوو بکەین بۆ زانینی لێرەدا هیگڵ ئەزانی (ئەنکسا گوراس) دەخاتە بەرباس، هیگڵ هەوڵ دەدات کە ئەو ڕێگاو شێوازانە بدۆزێتەوە کە چاودێری خوداوەندو کاریگەری دەبێ بۆ مێژوو، هەروەها دیاردە مێژوویی یەکان دەربخات بۆ ناسینی خودا، هیگل بیروباوەڕەکان دەهێنێتەوە بەر باس و لێکۆڵینەوە، مادام کێ ڕای گشتی لەوێدا رادەوەستێت کە جێی باس و پرسیار بێت ئەویش نێوی ئەوەیە کە دەڵێ (ناسینی خودا موستەحیلە) ئەو باوەڕە بلاوە لە ناوەرۆکیدا دژ بە دژێکی راستەوخۆ هەڵدەگرێ لەگەڵ ئەوەی کە کتێبی پیرۆز فەرمانمان پێدەدا بەوەی کە ئەرکێکی پیرۆزە. ئەمە ئەوەیە کە پێویست ناکات تەنها خودامان خۆش بوێت بەڵکو دەبێ بیشیناسین ئەمەش ڕەت کردنەوەیە بۆ ئەوەی کە کتێبی پیرۆز وتویەتی کە ڕۆح بەرەو ڕاستیمان دەبات هەموو شتێ دەزانێت و دەچێتە نێو قولایی کاروبارکانی خودامان. کاتێ ئەو بوونە خوداوەندیە بەو شێوەیە دادەنرێ کە لەدیو زانینمانەوەیە کە لە دەرەوەی سنووری هەموو کاروباری مرۆڤدایە، دەبێ ئەودش بکەین کە دەوری خۆمان دەربخەین،

فەلسەفە ناچار بوو لەم سەردەمە نزیکەدا کە بەرگری بکات ئەویش لە بواری دیندا دژی ئەو شالاوانەی کە ڕێبازە لاهوتیە جۆربەجۆرەکان هەستان پێی، لە دیانەتی مەسیحیەتدا خودا خۆی ئاشکرا دەکات مەبەستم ئەوەیە کە خۆی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی لێی تێ بگەن کە ئەو

چییە. ئەمەش بە شاراوەیی و حەشاردراوەی نەمایەوە، دەتوانین ئەو خودایە بناسین، کە خۆیمان بەو شێوەیە دەخاتە بەردەم، ئەم ناسینە ئەرکێکە لە سەرمان کە بزانین، خودا نایەوێ کوڕەکانی ئاوەزیان بۆش بێت یان دەروونیان چرووك بێت، بەڵکو دەیەوێ کە بە سروشتی دەرونیان شێوەی هەژاری وەرگرت بەڵام دەوڵەمەند بێت بە زانینیان بۆی،

دەبێ ئاوەز بناسین کە خۆمان وا دابنێین کە پشتی پێ دەبەستین بۆ ڕاڤەکردنی دیاردەکانیان، بێئەو ناسینە بۆ ئاوەز هیچ پێشکەوتنێك ڕوونادات تەنها قسەیە.

# سروشتی مێژوو

وشـەی مێـژوو لـە کـارپێکردنیدا فەرهەنگێکـە دوو بەشـی جیـاواز دەگەیەنێت، لە هەندێ کاتدا ئەو کارانە دەگرێتەوە کە ئەنجام دراوەو مرۆڤ پێی هەستاوە هەر لە کۆنەوە. زۆرجار بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێ واتـە بـۆ ئـەو ڕووداوو بەسـەرهاتانەی کـە ڕووی داوەو لـە دوایـدا کۆکراوەتـەوە یـان نوسـراوەتەوە، بەم شـێوەیەش مێـژوو دەچێتـە ئـەو چوارچێوەیەوە کـە بـۆی دیـاری کـراوە. واتـە ئەو بازنەیەی کـە ئـاوەز دروسـتی کردۆتـەوە، لـە پێشـدا ئەفسـانەو ئەندێشـەکان و وەهمـەکان کاریگەریان کرد بۆ دروست بوونی مێژوو. بەڵام پێداویستییەکانی ژیان و تـەنگ و چەڵەمـە تایبـەتی و گشـتییەکان وای کـرد کـە مامەڵـە کـردن لەگەڵ بوویەردا (واقع) بگونجێ یان خۆ بگونجێنێ. لە دایك بوونی مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە توانای مرۆڤ بۆ بیرکردنەوەی لە ڕابردووی و هەست کردن بە هونەری جوانی و گێڕانەوەی ڕووداووکان و هێنانەوەی

بۆ سەردەمی خۆی لە چوارچێوەیەکی جواندا، مرۆڤ نەیدەتوانی مێژوو بنوسێتەوە چونکە پێداوستی‌یەکانی نەبوو بۆ نوسینی مێژو، ئەمەش واتە مێژوو بەهرەیەکی گشتی زۆر ساکار بوو بریتی بوو لە گێڕانەوەی پشتاوپشتی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕابردوو لە شێوەی داستان و چیرۆکی کـرچ و کـاڵدا، هـەروەها لـە شـێوەی شـیعردا، چونکـە مرۆڤـی سەرەتایی بە هۆی شیعرەوە بیروباوەڕی خۆی دەردەبڕی بە تایبەتی شیعرە داستانیەکان ئەوانەی بە شان و شکۆی پاڵەوانانی جەنگدا دەیان هۆنیەوە، شیعر یەکەم ڕەوتی ئەدەبی بوو کە لە دایك بوو، ئەم سیستەمە توخمە مێژوویی‌یەکانی بوون کە لە چوارچێوەی ئەفسانەدا خۆی دەنواند چونکە ئەفسانەو خورافەکان و چیرۆکەکان دەچوونە دڵەوە لای مرۆڤی سەرەتایی چونکـە سـاکار بـوون، شـیعر گەیشـتە ڕادەیـەکی بـاڵا لـەنێو گەلاندا پێش لـە نوسـینەوەی مێـژوو چونکـە نزیـك بـوو لـە پەخشـانی مێژوویی‌یەوە، یان بە شێوەی (ئیپۆس Eposc) دەریان دەبڕی کە پشتاو پشـت بـۆ نـەوەی داهـاتوو دەمایـەوەو هـەر ڕۆژەی خـەیاڵی فراوانـی ئادەمیزاد شتی نوێی دەخستەسەر وەك داستانی (گلگامێش)ی بابلی و (ئیلیادە) گریکی و (ئۆدیسـا)ی گریکـی و (ڕامایـان)ی هنـدی هـەروەها (مەهابەهارات)ی هندی.. هتد.

# مێژووی نوسینی مێژوو

مامۆستا شوتول Shotwell لە نوسینی مێژووی مێژوودا دەڵی کە تا سەردەانێکی نزیك مێژوو و مێژوونوسی کەم بوو، مێژووی هەموو شتێك لە ژێر خۆردا دەنوسرا، بۆ ئەدەب و هونەرو فەلسەفەو زانست، تا ئەم ساڵانەی دوایی بێجگە لەو دانراوە کەمانەی کە بایەخیان کەم بوو تا ئەو سەردەمە چیرۆکی مێژوو نەنوسرابوو، شوتول بە گەمانێ دەڵێ (کلیو- خوداوەندی مێژوو- خۆی خەریك کردبوو بە نوسینی ڕابردووی ئەوانی تر، خۆی بە نوسینی مێژووەوە خەریك نەکرد کەسیش پرسیاری لێنەکرد لە ڕابردووی خۆی، مێژووی نوسینەوەی مێژووی لە سەردەمی کۆندا ئەو بەرەوپێشەوە چوونەی نەبوو بە تایبەتی لە خۆرهەڵاتی ناوەنددا، دوای دۆزینەوەی نوسین و درەنگ هاتنە نێو گەلانی ڕۆژهەلات نەدەتوانرا ئەو نوسراوە کە دەنوسرانەوە وەك دیکۆمێنت هەڵگیری لە پەرستگاکاندا، سەرەڕای ئەوەی شارستانێتی میسرو وڵاتی

میسۆپۆتامیا پێشکەوتوو بوو بەڵام نەدەتوانرا پێی بڵێین مێژوو، ڕووداوەکانی فرعەونی میسری و هەڵگرتنی وەك مێژوو ئەوەش هەموو بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەی فرعەون بوو، ئەویش لە ڕێی ڕووداوەکان و ژیانی فرعەونەوە، لە بابلیش نوسنیی مێژوو لە شێوەی هەڵکۆڵین لە شێوەی وێنەدا لەسەر ڕووکاری دیوارەکان، لەلای ئاشووریەکان دیکۆمێندی پادشاکان بوونە مێژوو کە لە ڕووداوی جەنگ و ڕاو دەدوا، بە هیچ شێوەیەك ڕەخنە نەبوو لەو دیاردانە بۆ تۆمارکردنی سەرەتایی بۆ مێژوو، ئارمانجی ئەو هەڵکۆڵینەش ئەوەبوو کە دەسەڵاتدار شکۆمەند بێت لای ئەوەی دواتر شکۆمەندتر بێت و ئەو ڕاستیانەش کە ڕوویان دەدا نەدەخرانە نێو ئەو تۆمارکردنە بۆ ئەوەی لە بیرەوەریەکاندا جێگایان نەبێتەوەو لە یاد بکرێت چونکە زۆربەی ئەو تۆمارانە یان ئەو هەڵکۆڵین و دیکۆمێنتدنە دین و دیاردەی خوداوەندەکانیان بەسەردا زاڵ بوو بە تایبەتی ئاپارتمانی خوداوەندەکان، (بارنز Barnes) دەڵێ باری کەش و هەوا یاریدەی ئەوەی دا میر- پادشا ببێتە شوێنەوارێکی مێژووی ڕاستەقینە یان وەك (برستد Breasted) دەڵێ وای لێ هات میر بوە کتێبێکی مێژوویی گەورە کە یارمەتی هەڵگرتنی سەرچاوە بە سوودەکانی دا هەروەها بەهای ئەو زانیاریە مێژووییانەی کە لە نێو ئارامگای پادشاو کۆشکەکان و پەرستگاکان و شوێنەوارەکاندا بوو، بەڵام هەندێکیان وەك مێژوو مانەوە، یەکێك لەو نوسراوانە کە دەربارەی

(تخرنفس ی سن)ی نووسی که بەو پادشایەدا هەڵیدا لە داگیرکردنەکانیدا، کاتێ ڕۆشنبیری هیلینی کاری کردە سەر ڕۆشنبیری میسری کۆن، نوسەرێکی میسری هیلینی هاتە سەرشانۆ کە هەموو ڕووداوەکانی مێژووی میسری کۆکردەوەو ڕووداوە مێژوویی یەکانی نوسی لەکاتی خۆیدا بایەخێکی تایبەتی هەبوو ئەو نوسەرەش (مانیتۆ Manatho) بوو ئەم نوسەرە بەوە ناسراوبوو کە ڕاستگۆ بوو لە لێکۆڵینەوەکانیدا هەروەها لێکۆڵینەوە بابەتیەکانیدا لە هەموو مادە مێژوویی یەکانداو ڕاڤەکردنیان هەروەها بابلی یەکان و ئاشووریەکان زۆر لە میسریەکان پێشکەوتووتر بوون لەلایەن کۆکردنەوەی دیکۆمێنتە مێژوویی یەکان بەلام مێژنووسێکی وەك (مانیتۆ)ی تیا هەڵنەکەوت تا بتوانرێت کاریگەری شارستانێتی هێلینی لە سەریان بێت بەلام لەگەڵ سەرهەڵدانی مێژوونوس (مانیتۆ) لەلای بابلی یەکانیش مێژوونوسی (کاهن) بیروسوس (Berossos) سەری هەڵداو هەر لە سەردەمی (مانیتۆ) مێژووی بابلی نوسی یەوە، کۆنترین نوسراوی مێژووی ئاسیای ئەو دیکۆمێنتانەیە کە نووسەر سۆمەریەکان نوسیویانەتەوە، بەلام ڕووداوی مێژووی تیا بەدی نەدەکرا، سەرەڕای ئەوەش جۆرێك لە نوسینی مێژوو سەری هەڵنەدا تەنها ئەوە نەبێت کە باسی پادشا کۆنەکانی میسری و بابلی و ئاشووری دەکرد ئەمەش وایکرد کە شێوازێکی بالاو ڕەچەڵەکی هونەری نوسینی مێژوویی نەبینێ بەخۆیەوە. چونکە سەربەستی تیا

نەبوو تەنها دیکۆمێنتەکان باسیان لە پادشاو مەلیکەکان دەکردو تەنها دەنگ و باسی چینی دەسەڵاتداریان تیادا تۆمار کردبوو لەبەر ئەوەی پادشاکان لە چاو خۆیانداو لە چاو خەڵکاندا خوداوەند بوون و بەسەر زەویدا دەڕۆیشتن.

# چینییەکان و نوسنیی مێژوو:

(روبرت فلنت) دەڵێ (چینییەکان بەسەر هەموو نەتەوەی ڕۆژهەڵاتدا لە پێشتر بوون لە لایەن ئەدەبی مێژووەوە) ئەویش بەهۆی ئەوەی کە چینییەکان زۆر تامەزرۆی ڕاستی ژیان بوون و سۆزیان بەرامبەر ڕاستی ژیان هەبوو هەروەها ڕێزیشیان بۆ ڕەچەڵەکیان هەبوو، هۆگری ڕابردوو بوون، هەروەها زانابوون لە دەرك کردنی ڕامیاریان و یەکسانیان لە دەرکردنی فەرمانەکاندا، ڕێزیان بۆ زانست و ڕۆشنبیری هەبوو سەرەڕای ئەوەش مەیلیان بۆ پزیشکی و زانست هەبوو، چینییەکان مێژوونوسیان زۆرە، ئەو ڕووداوانەی کە بایەخیان دەدا بە مەسەلەی نەتەوایەتی، ئەدەبی چینی گەورەو بەرفراوانە کە تایبەتمەندی مێژووی خانەوادەی تایبەت دەکات، هەروەها خاوەنی فەرهەنگێکی مێژوویین کە پڕە لەزانیاری بەنرخ، نوسراوەکانیان شێوەیەکی تایبەتی و بەزەوقێکی چینی نوسراوەتەوە کە شێوەیەك زۆر زەحمەتە، سەرەڕای ئەوەش

نوسینی مێـژوو پێـش نەکـەوتبوو لـە لایـان بـەڵکو هـەر لـە ئاستی (حولیە)تدا بوو، مێژوونوسانی چینی بە ڕاستی خۆیان خەریك دەکرد بە کۆکردنـــەوەی زانیـــاری و کۆکردنـــەوەی دیکۆمێنتەکانـــەوە بـــەڵام نەیاندەخستە نێـو تـەرازووی ڕەخنـەوە، بـەدوای هۆکـارو پێشـکەوتنە ناوەکی‌یەکان نەدەگـەڕان کـە ڕووداوی مێژوویی‌یـان لێ دروسـت دەبـوو، نەیان توانی بگەنە تێڕوانینی گشتی وایان دەبینی کە مێـژوو هونەرێکە لە هونەرە نەتەوەیی‌یەکان، نەك ئاوێنەیـەك بێت و سروشـتی بەشـەریەت پێشان بدات، بەناوبانگترین مێژوونوسـیان (سـیزماتیان ١٤٥- پ. ن) و (سـیریمکا کوانـج) کـە بـەناوی مـیری مێژوونوسـان نـاوی دەرکردبـوو، یەکەمیان بە نوسـینی دیکۆمێنتـی مێژوویـی کـە بایـەخی (حولیـات)ی چینی بوو لە سەردەمی (هوانج تی) دەی‌نوسی تا ئەو سەردەمەی خۆی تیـایدا ژیـابوو دووەمیـان مێـژووی ١٣٦٢ سـاڵەی چینـی نوسـی‌یەوە ئەوەش وای کرد کە مێژووی چینـی تـری بخرێتـە سەر تا ڕووداوەکانی سەدەی هەژدەهەم ئەم کتێبەش گۆڕدرا بۆ زمانی فەرەنسی.

# یابانیەکان و نوسینی مێژوو:

یابانیــەکانیش وەك چینیــیــەکانیان لێبەســــەرهات لەلایــەن نوســـینی مێژووەوەوە لەو مەسلانەی کە تا سەدەی بیست، هەمیشە کێشەی لەسەر بوو مەسەلەی سەرهەڵدانی مێژووی یابانیە، کە ئایا ئاکامی (حافن)ی نەتــەوەیی بــوو، یــان کاریگــەری نــەو تێکەڵاوبوونــە بــوو لەگــەڵ چینیەکاندا، پسپۆرە ئەوروپیەکان لە لێکۆڵینەوەی یابانیدا دەڵێن کە نووسینی مێژوویی یابانی ڕاست دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شەشی پێش زایــین، کۆنــترین دیکۆمێنتــی یابــانی کــە کۆکراونــەوە لــە کتێبێکــدا دەگەڕێتــەوە بـۆ (ســاڵی ٧١٢ن) کــە گــۆڕدراوە بــۆ زمــانی ئینگلــیزی (حولیات)ی یابانی کە بە نێوی(نیهونجی) دەرکردووە کـە سـاڵی ٧٢٠ تەواو بووە کاریگەری مۆرکی چینی لەسەرە، لە سەدەی هەشت و نۆدا چەند کەسێك لــە نوســەران بەشــداری نوســینی کتێبــی دیکۆمێنتــی مێژوویی‌یان کرد، یەکێك لەو مێژوونوسانە (سیجوار میشیزن) بوو لە سەدەی ١٠ بۆ ١٣ نوسینی مێژوویی لە یاباندا پێشکەوتنی بەخۆیەوە

بینی، کە ڕوداوی ڕاستی و بیروباوەڕی مێژوویی بەخۆوە بینی، لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا (حولیات)ی زۆر هاتنە سەرشانۆ، بەڵام هاتنە سەرشانۆی مێژوونوسی لێهاتوو کەم بوو لەو سەردەمەدا هەروەك چۆن لە سەردەمی دەرەبەگایەتی ئەوروپا ڕوویدا، پێش کۆتایی سەردەمی دەرەبەگایەتی مێژوونوسێکی ناودار سەریهەڵدا ئەویش (میتوپادشا ١٦٢١-١٧٠٠) بوو کە هەندێ لە زانایانی یابانی و چینی هاوکاریان کرد لە نوسنیی کتێبەکەیدا کە باسی لە مێژووی یابان دەکرد تا ساڵی ١٤١٣ مەبەستی ئەو نوسینەی لەوەدا بوو کە سیستەمی (شوجانات)ەکان تێك بدات کە ئەوان دەسەڵاتیان گرتەدەست و خەڵکیان دەچەوساندەوە، نوسەر لێرەدا زیرەکانە توانی بگاتە ئارمانجی خۆی و بووە هۆی هەڵگیرسـ نی شۆڕشێك کە کۆتاییەکەی ساڵی ١٨٦٨ بوو یەکەم مێژوونوس کە پلەی زانستی پێدرا هاکیسیکی بوو (١٦٥٧-١٧٢٥)، یابانیەکان بە مەزنترین مێژوونوسی خۆیانی دەدەنە قەڵەم، هەروەها گەورەترین مێژوونوسی یابانی (رابی سانجو ١٧٨٠-١٨٣٢) بوو کە بە ڕەخنەگرێکی بە توانا ناوی دەرکرد، هەروەها مێژنووسانی تر هەڵکەوتن وەك (مورتوری نوریناجا ١٧٣٠-١٨٠١) و (هیدانا استیانی ١٧٧٦-١٨٤٣) یەکێك لە شێوازە جیاکانی ئەدەبی یابانی زۆدی چیرۆکە مێژووییە یابانیەکەیەتی کە زۆربەیان مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەهەم و پانزەهەم.

## هندو نوسنیی مێژوو:

هند بە دەوڵەمەندی ئەدەبەکەی بەناوبانگە، شیعرو فەلسەفەی هندی ناودارترین شێوەیە لە شێوەکان، بەلام بەهۆی زۆری تێکەلاوی نەتەوەو هۆزو تیرەی دی لە هندستاندا هەر لە کۆنەوە بووە هۆی ئەوەی یەکێتی یەکی سیاسی کۆیان نەکاتەوە، ئەمەش وای کرد هۆکاری جیاوازی لە داب و نەریت و زماندا نەهێڵێت کە بووە هۆی ئەوەی نوسینی مێژوو سەرهەڵنەدات بۆیە لای هندوسەکان مێژووی نەتەوەیی بەدی ناکرێ کە نوسرابێتەوە، هندیەکان توانیان کە بیروباوەڕی خۆیان دەربڕن لەنێو کتێبی (فیدا) یا کە باسی ژیانی کۆمەلایەتی تیرەیەکی هندیە ئاریەکان دەکات و هەروەها سەرنجیان دەربارەی خوداو گەردون و مرۆڤ دەردەخات، بەلام ڕووداوی ڕۆژانەو ژیانی کۆمەلایەتیان تیادا تۆمار نەکردووە هەروەها ڕووداوەکانی دەوروبەریان تۆمار نەکردووە، لێکۆڵەرەوەکان زۆر زەحمەتی دەبینن لە دەرهێنانی ڕاستی یە

مێژوویی یەکاندا لەنێو سیستەمە شیعرەکانی هندیدا، کۆنترین نوسینی هندی هاوپێچە لەگەڵ ئەوەی مێژوویی دایە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەم کە ئەویش لێڵی پێوە دیارە. بەناوبانگترین نوسین (پادشاکانی کاشمیرا)یە کە ڕۆحی شیعری و ئەزعەی ئەفسانەیی پێوەدیارە.

## یەهودیەکان و نوسینی مێژوو:

(بارنز) لە کتێبەکەیدا (شێوەی نوسینی مێژوو)دا دەڵێ (کە شەرەفی نوسینەوەی یەکەم گێڕانەوەی میژوویی مافێکی بەرچاوی هەیە و لە هەمان کاتد وردبینی یەکی بلیمەتانەیە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ یەهودیەکانی فەلەستینی کۆن) زۆربەی ئەو نوسراوە یەهودیانە کە مێژوویین لە دووتوێی (پەراوی پیرۆز) لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی کۆندا هەندێ لە پیاوانی کڵێسە ئەوانەی بەلای گومڕایی دا دەچوون، گومڕابوون لە ڕاستی بیری باو لەلایەن دانراوی پەڕاوی پیرۆزەوە، یەکەم لێکۆڵەرەوە کە بایەخێکی زۆری دا بە ئاڕای باو ئەویش زانای سەردەمی

ناوەندی (ابن عزرا) بوو کە لە ساڵی ١١٥٠دا توانی بەربەرەکانی ئەوە بکات کە (موسی) داهێنەری پێنج سەفەرەکەیە، لە سەدەی هەڤدەدا فەیلەسوفی ڕەخنەگر (توماس هوبزشکە) ئەوەی ڕاگەیاند کە دانراوی موسی بۆ پێنج سەفەرەکە لەسەر بنگەی لۆژیك و تێگەیشتنە دەرەکیە گشتییەکان بووە نەك لەسەر بنکەی توێژینەوەی دانەر ژیانی خۆی بنوسێتەوە تا مردنی، هەر پێنج سەفەرەکە بە جوانی باسی ئەو ئازارانە دەکات کە یەهودیەکان دووچاری بوون دوای مردنی، زانای یەهودی (باروخ ئەسبنوزا) کە هاوچەرخی (هوبز) بور لێکۆڵینەوەی ڕەخنەی دروست و ڕاست کرد لەسەر شێوازی سەفەری دروست بوون، ئەوەشی دیاری کرد کە ئەو سەفەرە تەنها یەك دانراوی نەبووە واتە یەك نوسەری نەبووە لە یەك کاتدا، بەڵگەی نیشاندا کە تیۆری دانراوی (موسی)ی بۆ پێنج سەفەرکەی ڕەت کردەوە (بارنز) دەڵی کە لێکۆڵەرەوە نوێکان وەك (دلینزس) و (ونکلر) و (روجرز) دەریان خست ئەفسانەکان و نەریتی دینی بابلی کاریگەریان هەبوو لەسەر دینی یەهودی، بە تایبەتی لەسەر وێك چوونی چیرۆکی دروست بوون و بورجی بابل و لافاوەکە، هەروەها زۆر زاناو لێکۆڵەرەوەی تر بیری دۆزەخ و شەیتان و نەمری ڕۆح دەگێڕنەوە بۆ سەرچاوە فارسیەکان، (بارنز) دەڵێ (پلەپایەی یەهودیەکان لە سەردەمی پادشاو مەملەکەتە یەککگرتووەکەیاندا لە سەردەمی شاول و داودو سلیمان دەگمەن بووە بۆ لێکۆڵینەوەی نوسینی مێژوو کۆنترین

هەوڵیان بۆ نوسینی مێژوویی دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵدانی نوسەرە نەناسراوەکان بۆ نوسینی شێوەی پێنج سەفەرەکەو سەفەری (یەشوع) و سەفەری (صموئیل)ی یەکەم و دووەم هەروەها سەفەری یەکەم پادشاکان، (برستد)ی مێژوونوس دەڵێ (ئەم سەفەرانە کۆنترین نوسینی مێژووە لای نەتەوەکان کە هەیانبێت، هەروەها دانەرە نەناسراوەکەی بە کۆنترین مێژوونوس دادەنرێ لە سەردەمی کۆندا، (ادوارد میر) دەڵێ (جێی سەرسوورمانە کە ئەدەبی مێژوویی هەبێت لەو شێوەیەو لەو سەردەمەدا لەلای ئیسرائیلیەکان)، (ئەبیاثار)ی مێژوونوس دەربارەی مێژووی داودی نوێ بە زمانی عیبری کە بەرزترین پلەی مێژوویی ئەو سەردەمە بووەو دواترین مێژوونوسی سەردەمی کۆن (فلافیوس یوسیفوس)ی یەهودی بووە (٣٧-١٠٥) کە بە مێژوونوسی نەتەوەیی دادەندا دوای ئەوەی دەوڵەتی یەهود لەدەست چوو وایکرد کە بۆ ئەوەی جارێکی تر ژیان بێتەوە بەر گیانی یەهودیەکان و بیر لە پشێویان بکەنەوە دەستی دایە پیاهەڵدان و زۆر ڕەوی بۆ پێشووی یەهودیەت، (روبرت فلنت) دەڵێ یەهودیەکان لە ڕووی دینییەوە سەیری ڕووداوەکانیان دەکرد، خودا لەلایان هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ بزاوتنی مێژوویی، ئیرادەی خوداش مەحەکە بۆ بڕیاری مێژوویی، شارەکەشی ئارمانجێك بوو کە پێشکەوتنی مێژوویی چووە ناوی، یەهودیەکان بەوە ناسراون کە زۆر بە توندی گیرۆدەی مێژووی کۆنیانن.

## نوسینی مێژوو لای یونانیەکان و ڕۆمانیەکان:

سەرچاوەکان دەڵێن یەکەمجار نوسینی مێژوو لەلای یونانیەکانەوە داهات کە خۆی لە شیعردا دەبینییەوە لەلایەن (هومیروس)ەوە کە ئەمەش ڕاست بوو، لە شیعرەکانیدا زانیاری زۆری دەربارەی کۆمەڵ و ڕۆشنبیری یۆنانی تیادا بوو، کە دەتوانرا وێنەیەکی شارستانی ڕوونی سەردەمی خۆی دیاری بکرێت لە شیعرەکانیدا، بەڵام لە دایک بوونی نوسینی مێژووی یونانی لە شێوازی نوسینەوەی مێژوو پێویستی بە پێشینەی مێژوویی هەبوو کە لەلای یۆنانیەکان ئەو پێشینەیە نەبوو تا سەدەی شەشەم ئەو پێشینەیەش کە هەبوو لە شێوەی پەخشاندا بوون، هەروەها ڕوانینە ڕەخنەکان بۆ ئەفسانە باوەکان و لێکۆڵینەوە بۆ شێوازی کۆمەڵگاو سەرهەڵدانی سیستەم و یاساو داب و نەریتەکان، لە نیوەی سەدەی شەشدا ئەو پێداوستییانە پەیدابوون بۆ نوسینەوەی مێژوو، لە شاری(میلیتس لە ئەیونیای ئاسیای بچووک) هەر لە سەرەتای سەدەی شەشەم (کادموس میلتی) دەستی کرد بە نوسینەوەی پەخشان

لە جیاتی نوسینی شیعر کە بە یەکێك لە پێشەوەیانی نوسەرانی پەخشانی ئەدەبی یونانی دادەنرێت هەر لەو کاتەشدا فەلسەفەی ئەیونیە سەری هەڵدا کە شێوازی بیرکردنەوەی سەربەستی پێوە بوو هەروەها رەخنەی بەهێزکرد، مامۆستا (بری) لە ل٢٢دا لە کتێبەکەیدا (مێژووی سەربەستی هزر)دا دەڵێ (ئەیونیا لە ئاسیای بچووکدا کە لانکەوی بیری سەربەست بوو)، هەروەها مێژووی زانستی ئەورووپی و مێژووی فەلسەفەی ئەورووپی لە ئەیونیاوە دەست پێ دەکەن لەوێ لە سەدەی پێنج و شەشدا فەیلەسوفەکان ویستیان لە رێگای عەقڵەوە بگەن بەسەرچاوەی جیهان و دروست بوون، ئەیانتوانی لەو عەقڵەیان رزگار بن لەو بیرو باوەرەی کە پێشو فێرکرابوون بەلآم دەستیان کرد بە روخاندنی ئەو باوەرەی دەپارێزێ، کە نەریتە دینییەکان، بزوتنەوەی دروست کردنی کۆلۆنیەکان و ئالوگۆری بازرگانی و کۆچ کردن بۆ رۆژهەلآت کاریگەری خۆی کردە سەر پێشکەوتنی شارستانێتی یونانی لە ئەیونیاو دەریای ئیجە کە رۆحی رەخنەی لە ئەیونیاییەکاندا چاند ئەو رۆحە رەخنەیە یاریدەی ئەوەی دا کە پێشکەوتن روویدات لە فەلسەفەو ئەدەب و نوسینی مێژوویی دیارە لێك دانی رۆشنبیری دەبێتە هۆی گەران بەدوای نهێنییەکان و فێربوون و کاریگەرکردن و کارکردنە سەر پێگەیشتنی عەقڵ یەکی: لەو مێژوونوسە یۆنانیە گەرۆکانە (هیکا تیوس) بوو (٥٥٠- ..) کاتێك فارسەکان ئەیونیایان داگیرکرد زیاتر یونانیەکان هەستان بە لێکۆڵینەوە لەو نەتەوانەی کە لە چوارچێوەی ئەو

ئیمپراتۆریەدا دەژیان کە بوون بە بەشێك لێی، نوسینی مێژوویی سەری هەڵداو کە بوو بە بەشێك لە بزوتنەوەی فەلسەفی لە ئەیونیاوە دەستی پێ کرد، زۆر بایەخیان دەدا بە جوگرافیاو لێکۆڵینەوەی ئاکارو نەریت و ئاداب و باری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری مێژووی گەلان، هەر بۆیە دیاردەی وەسف کردنی جوگرافی دیارە بەسەر نوسینە مێژووییەکاندا، ئەوبارە گونجاوە وای کرد کە مێژوونوس وەك )هیکاتیوس میلیتی) بێتە سەر شانۆو کە دانیشتووی شاری (میلیتی)یە کە پەخشانی فەلسەفەی یۆنانی رەخنەیی تیادا هێنایە بەرهەم، کە بە شێوەیەکی زانستیانە مێژووی هەڵسەنگاند بە هۆی زانیاری راست و دروستەوە، هەروەها بەهۆی رەخنەی بەرامبەر ئەفسانە جیاوازەکان هەروەك خۆی دەڵێ (ئەمەی لێرەدا دەینوسم راپۆرتێکی راستییە، لەبەرئەوەی چیرۆکی یونانی زۆرن و جێی گاڵتەپێکردنن لەلای من)، لە ماوەی نوسینی (الانساب)ی (هیکاتیوس) و (مێژوو)ی (هیرودوت)دا (کارون لامیسکوس) و (دیو نیزیاس) توانیان مێژووی فارس لە نیوەی سەدەی پێنجەمدا بنوسن (سکایلاکس ی کریاندی) یەکەم رووداوی مێژوویی نوسیەوە لە کۆتایی سەدەی پێنجەمدا، هەروەها (انطیوکس سراقوسی) مێژووی یۆنانی نوسییەوە، (هیرودوت) بە شێوەیەکی رێك و پێك ساڵنامەیی گشتی مێژووی نوسییەوە، (هیرودوت) یەکەم مێژوونوس بوو کە پەیوەندی نێوان یۆنان و ئاسیای نوسی لەسەردەمی کروشیوش پادشای لیدیا (٥٦٠-٥٤٦) تا رووخانی فارسەکان لە ساڵی

(٤٧٨) جەنگی فارسەکان بایەخێکی تایبەتی هەبوو لای یونانیەکان بە تایبەتی، شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، (هیرودوت) تەنها مێژووی نەتەوە سەردەستەکانی دەنوسی‌یەوە بەڵکو دەنگ و باسی نەتەوە دوواکەوتوەکانیشی دەنوسیەوە لەبەرئەوە (هیوردوت) نەك تەنها باوکی مێژوو بوو بەڵکو باوکی (زانستی مێژووی سروشتی)یش بوو، (هیرودوت) گەڕیدەبوو حەزی لە کۆکردنەوەی زانست و زانیاری هەبوو، پرسیاری زۆر دەکرد دەربارەی ژیان و زانیاری کۆدەکردەوە دەربارەی داب و نەریت و دین و یاساو سیستەمەکان، ئەو شتانەی دەی دیت و گوێی لێ دەبوو چاوی پێدەکەوت دەینوسیەوە بەمەش نوسراوەکانی بوونە نوسراوە مێژوویی‌یە نەمرەکان، بە تایبەتی جەنگی نێوان یۆنان و فارسی بە جوانی و ڕاستی باس دەکرد سەرەڕای ئەوەش سۆزی نەتەوەیی بۆ یونان کاریگەری نەکردە سەر نوسینەوەی مێژوو بەڵکو فارسەکانی بە ئازاو چاونەترس داوەتە قەڵەم و بەمەش ڕەخنەی لە یونانیە نەتەوە پەرستەکان دەگرت، جەنگی یونان –فارس لای هیوردوت لێدانی دوو شارستانیەت بوو شارستانیەتی هیلینی و شارستانیەتی ڕۆهەڵاتی بۆ ئەو مەبەستە ئەو دوو توخمەی شی‌کردەوە، لێکۆڵینەوە شوێنەوارەکان ڕاستی قسەکانی (هیرودوت) دەردەخەن کە تا چەند ڕاست بووە لە نوسینەکانیدا، چونکە جیاوازی دەکرد لە نێوان ئەوەی دەیبینی و ئەوەی باوەڕی پێ‌یەتی، (هیرودوت) زۆر موعجبی دیموکراتی یونان بوو، سەرەڕای ڕێز بۆ ئازایەتی فارسەکان خۆشحاڵ بوو، لە

نوسینەکانیدا ئەوەی پێوە دیارە (دەست تێوەردانی خودارەند هەیە لە کاری مرۆڤـدا) زۆرجـار باسـی بـاری سروشـتی کـردووە لـە ڕووداوە مێژووییـیەکاندا، دوای هیرودوت (توکوتیـدس- ٤٥٦-٣٩٦) بـە دووەم مێژوونوسی یۆنانی دادەنرێت بەلاّم ئەم بە پێچەوانەی (هـیرودوت)ەوە مێـژووی دەنوسـیەوە، دوور لـە ئەفسـانەو خورافـەکان بـە شـێوەیەکی خۆشی دەینوسیەوە (توکوتیدس) سنوورێکی دانا لە نوسینی مێژوودا لە نێوان پرۆگرامی داسـتانی و کاریگـەری بیروبـاوەڕو ئـەوەی لەسـەرو سروشتەوەش و لە نێوان نوسینەوەی مێژوو کە هەڵدەسێ بە ڕاسـتی ڕووداوەکـان و هۆکـارە ماقوڵـەکان بـۆ ڕووداوەکـان و شـیکردنەوەیان، باسی گرنگی سەرکی توکوتیدس جەنگی (بلیبوسیە) بوو (٤٣١-٤٠٤) کـە کتێبێکـی دەربـارەی نوسـی لـەکاتی ئـەو جەنگـەدا نوسـینەکەی لـە شێوەی پـەیامنێرە ڕۆشنبیرەکان جـەنگی نـوێ دەچـوو، (بـارنز) دەڵـێ (هێزێکی تایبەتی هەبوو لە وێناکردنی ڕابردوودا، بەلاّم کتێبە مەزنەکەی (بەرزبوونـەوەی پێـش هـەموو شـتێك مێژوویـەکی هاوچـەرخ بـوو لەبەرئـەوەی خـۆی سـەرهەنگێکی ئـەثنیو سیاسـی بـوو)، لەبەرئـەوە مێژوونوسـی ئـەڵمانی (لیبولدفـون انـك) لـە سـەدەی نۆزدەهـەمدا دوای ڕاستی ڕووداوەکان کەوت لە نوسینەکانی (توکوتیـوس)داو لـە هـەمان کاتدا ڕەوتی نوسینی پرۆگرامی زانسـتی ئـەوی گرتەبـەر لـە نوسـینی مێژوودا، لە دیدی سیاسیانەوە دەیڕوانیە مێژوو، وەك سیاسـەتمەدارێکی فەیلەسوف وابـوو لـە پێکـەوە لکـاندنی تـەنگ و چەڵەمـەی مێژوویـی و

هۆکاری سیاسیدا، سەرەڕای ئەوەی هێزێکی سایکۆلۆژی هەبوو بۆ پێگەیشتن لە دەروونی تاك و کۆمەڵ، بە تایبەتی وێناکردنی کەسایەتی ئەو کەسایەتیانەی لە هەڵوێستە جیاوازەکاندا دیاربوون لەسەر شانۆی (شۆڕشی ساڵی ٤١١ی پ. ز)، (روبرت فلنت) دەڵێ (هیچ بەڵگەیەك نیە کە بەبێ ئیمانی دابنێین، بە هیچ شێوەیەك ڕێی نەدەدا کە هیچ ئیماندارێك کاریگەری بکاتە سەر نوسینە مێژوویی‌یەکانی یان باوەڕی مێژوویی‌یەکەی، بە ڕاستی ئەیویست نوسینی مێژوویەکی ڕاست بنوسێتەوە) ڕەخنەیان لێ ئەوەبوو کە بایەخی هۆکاری جوگرافی لە مێژووەکەیدا نەبوو سەرەڕای ئەوەش پەی بە کاریگەری هێزی ڕۆشنبیری و کۆمڵایەتی و ئابووری نەبرد بۆ ڕەوڕەوەی مێژوو واتە لەو لایەنەوە بێئاگا بوو، دوای ئەو مێژوونوسی بەناوبانگی یونانی (هوبولیبیوس ١٩٨-١١٧) هاوشان بوو لەگەڵ (تکوتیدس) لەسەر مەسەلەی گەڕانی وردبینی زانستی لە مێژوودا، شێوازێکی تایبەتی نەبوو وەك (هیرودوت) یان (توکوتیدس) خوێنەر نوسینەکانی ئەویان زۆر بەدڵ نەبوو، مێژووەکەشی هەوڵدان بوو بۆ درێژەپێدانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و پێشکەوتنی سیستەمی سیاسی تا ساڵی ١٤٦ لە نێوان ٤٠ بەرگدا زیاتر لە (توکوتیدس) جەختی لەسەر مەسەلەی مێژوونوسی شیاور لێهاتوو دەکردەوە بۆ نوسینی مێژوویی، دەبوایە ئەو مێژوونوسە لێهاتووە (یەکێك بێت لە گەورەپیاوانی کاروبار، باشتر وایە سەرهەنگێك یان پیاوی دەوڵەت بێت). (هیرودوت) بایەخی

مێژوونوسانی یۆنانی دەدا بە ڕۆژهەڵات (توکوتیدس) باسی مێژووی پەیوەندی دەرەوەی ئەسینای دەکرد کە لە کاتی ترۆپکی شارستانیەتیدا بوو، بەڵام (بولیبیوس) وێنەی یۆنانی پێچەوانە دەکردو لە حاڵەتی دواکەوتوییدا وێنای دەیکرد بایەخیشی بە ڕۆمانیا دەدا بۆ دەست بە سەراگرتنی ڕۆژئاوادا، سەرەڕای ئەوەی ڕەچەڵەکی یۆنانی بوو بەڵام زۆربەی ژیانی لە ڕۆمادا بەسەربرد لە نوسینەکانیدا زیاتر بەلای ڕۆمانیادا دەیشکاندەوەو لە بارەی سیاسەت و جەنگەوە، بایەخی بە مەسەلەی جوگرافی دەدا لە ڕووداوە ڕاستیەکانی مێژوو، گرنگی دەدا بە مەسەلەی هۆکار لە ڕووداوە مێژووییەکاندا، ڕاڤەکردنی بۆ مێژوو لایەنی ئاکاری زۆر پێوە دیار بوو وەك لایەنی ئابوری یان لایەنی کۆمەلایەتی، هەروەها مێژوونوسانی تر سەریان هەڵدا وەك (زینفون ٤٣٠-٣٥٤) و (فلوطار خس ٥٠-١٢٥ م) کە تایبەت بوو بە وەرگێڕانی مێژوویی، لە سەردەمی بوژانەوەی ڕۆشنبیری یۆنانی لە ڕۆمادا مێژوونوسانی تر سەریان هەڵدا وەك )ئەریان ٩٥-١٧٥) کە دانەری کتێبی (ژیانی ئەسکەندەری مەقەدونی)یە.

# ڕۆمانیەکان و نوسینی مێژوو:

ڕۆمانیەکان هیچ شتێکی نوێیان بۆ ئەدەبی مێژوو زیاد نەکرد، ڕێی یۆنانیەکانیان گرتەبەر کە ببونە نموونەو پێشەوا بۆ یۆنان لە هەموو ڕوویەکەوە، لە نێوان ڕۆمانیەکاندا چەند مێژوو نوسێك سەریهەڵدا وەك (لیفیوس) و (تاسیۆس) کە ئیعتمادیان دەخستە سەر مێژوونوسانی یۆنانی لەنوسینەوەی مێژوودا، تا سەدەی دووی میلادی ڕۆمانیەکان بە زمانی یۆنانی ئەدەبی مێژوویی‌یان دەنوسی‌یەوە، وەك مێژوونوس (فابیوس بکتور ٢٥٤- ..) هەروەها (ئینساس)ی شاعیر کە سالی (١٦٩..) مردووە، بەلام یەکەم مێژوونوس کە هەڵکەوت (یولیوس قیصر ١٠٠-٤٤) بوو کە لە هەموویان پێشکەوتووتر بوو کە بە یەکێك لە یاداشت نوسە مەزنەکان دادەنرێ لە جیهانی کۆندا هەروەها مێژونوسی ڕۆمانی (سلوستوس ٨٦-٣٤) و کتێبە مێژوویی‌یەکەی دەربارەی مێژووی ڕۆما لە سالی ٧٨ تا سالی ٦٧ کە نەدۆزرایەوە، بەلام

دەربارەی پیلانی (کاتلین) و پاڵەوانی ئەفریقی (یوجورتا) ی نوسی کە بە جوانترین شێواز نوسی ببوەوە کە چۆن کەسایەتی‌یەکانی وێناکردبوو ئەوجا مێژوو نوسی نەتەوەیی مەزن (تیتوس لیفیوس ٥٩-١٧) کە بە یەکێك لە مەزنترین چیرۆك نوسەکان دادەنرێ لە ئەدەبی جیهانیدا، هەستی نەتەوەیی زۆر توند بوو لای هەروەها هەستی نەتەوەیی نیشتمانی لای لاوانی ڕۆمانیای جۆش دا، دینداریتی وەك نیشتمانپەروەری وابوو لای ، ڕووداوەکانی مێژوویی دەگەڕانەوە بۆ دەست تێوەردانی ئەوەی لە سەرو سروشتەوە بوو هەروەها دەستی خوداوەند لە ڕەوڕەوەی مێژوودا، هەروەها مێژوونوسی ڕۆمانی (بوبلیوس کورنیلیوس تاسیتوس ٥٥-١٢٠) یەکێك بوو لە پیاوانی خاوەن پیشە، بە وردبینی ڕووداوەکان ناوی دەرکردبوو هەروەها کاریگەری پڕوپاگەندەی ئاکاری پێوە دیاربوو لە نوسینەکانیدا بۆ هۆدۆزی ڕووداوەکان و دەی گەڕانەوە بۆ هۆی ئاکاری، زیاتر زانستیانە بوو بەلای سیستەمی کۆماری کۆندا مەیلی هەبوو، (سیتونیوس ترانکویلوس) دوا مێژوونوسی ناوداری ڕۆمانیە (٧٥-١٦٠) سکرتێری (هادریان)ی ئیمپراتۆر بوو بەناوبانگترین کتێبی (ژیانی دوانزە قەیسەرەکە)یە سەرچاوەیەکی گرنگی بڕواپێکراو بوو بۆ وەسف کردنی ژیانی گشتی لە کۆنترین نموونەی نوسینی مێژوویی‌یەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە عەیبە ئاکاریەکان ئاشکرا بکات، کە چیرۆکی ژیانی ئەباطرە

ڕۆمانیـەکان ڕوون دەکاتـەوە لـە سـەردەمی (اغطـس) تـا (فلافـین)ە ئـەباطرەکان. سـەرەڕای ئـەوەی میژوونوسـانی ڕۆمـانی ڕێگـەی میژوونوسانی یۆنیان گرتەبەر تەشەو عەیبە بێ دەرنەبون بەڵام ئەوەش لەیاد نەکەین کە بیروباوەڕی توندوتیژی پێوە دیار نەبوو، ئەفسانەش زۆر کاریگەر نەبوو بۆ سەر نوسینەکانیان.

## نوسینی میژوو لە سەرەتای سەردەمی مەسیحیەتدا :

سەرکەوتنی مەسیحیەت بەسەر (وثنیە)تدا کاریگەریەکی دووری کردە سەر نوسینی میژوویی هەروەها لە بیروباوەڕی میژوونوسان، ڕۆشنبیر (وثنـە)ت لەبـەر ئـەوەی بـەکاری شـەیتان دادەنـرا پوکایـەوە، نوسـینە میژوویی یـەکانی سـەردەمی (وثنیـە)ت ئاسـتی نوسـینە میژوویی یـە پیرۆزەکـانی نێـو تـەوراتی دابـەزاند. بۆیـە گومڕابـوون ڕۆڵ و بایـەخی بیرکردنـەوەی ئـاوەزی گرتـەوە کـە لـە لای یۆنانیـەکان پلەیـەکی بـەرزی هەبوو، دین پلەیەکی باڵاو ڕوکنێکی بەهێزی وەرگرت. باوەڕبوون بەوەی

لەسەرو سروشتەوە بووە جێی چاکەکان بەرهەمی هونەرمەندان و فەیلەسوفان وشك بوو، کتێبە یەهودیە پیرۆزەکان جێگای ئەدەبی کۆنی گرتەوە، شیعرەکانی (هومر) و دانراوەکانی (تکوتیدس) و (پولیبیوس) و (لیفیوس) و مێژوونوسانی سەردەمی وثنی وەلانران، کەئەوەش ڕۆی لە نوسنیی مێژوویی گرت و بووە لەمپەرێك لە بەردەمیدا سەرەڕای ئەوە نەتوانرا زاڵ بێن بەسەر ڕۆشنبیری وثنیەتدا کە کاریگەری خۆی هەبوو چونکە زۆرینەی پیاوانی دینی بە زمانی (وثنیە)ت دەیان نوسی چونکە فێری ڕۆشنبیری وثنیەت ببون لەوەوپێش واتە پێش ئەوەی بینە ناو دینی نوێوە، ئەمەش نەك تەنها پیاوانی وثنی بەڵکو سیاسیانی سەرەوەشی گرتەوە لە کاروباری ڕۆژانە بە شێوەیەکی پراکتیکی بە توخمە وتنیەکان ئەمەش وای لێکرد کە بیرکردنەوەی ئاوەزی بەسەر بیرکردنەوەی سۆزودا زاڵ بێت و ڕێگای ئەفلاتۆنی نوێیان گرتەبەر فەلسەفەش بەسەر هزری دیندا کاریگەری خۆی کرد وەك کاریگەری بۆ سەر بیروباوەڕی (قدیس اغسطین)، مێژوونوسە مەسیحیەکانی پێشوو وای بۆ دەچوون کە بزوتنەوەی مێژوو بەشێکە لە بزوتنەوەی گەردوون کە خوداو مرۆڤ بەشداری تیادا دەکات، ئەمەش لە کتێبی (شاری خودا)ی (قدیس اغسطین)دا بە ئاشکرا دەبینرێ، فەلسەفەی مێژوو لەو نوسینەدا لە سەرچاوەی فارس و هیلینی و عیبریەکاند وەرگیراوە، بزوتنەوەی مێژوو کێشمەکێشمی تێکەوت لە نێوان هێزی خێرو هێزی

شەڕدا، کە ئەمەش بە مانای مێژووی زەوی کێشمەکێشم دەگرێتەوە لەنێوان (شاری خودا)دا کە دەستەیەکن لە ئیماندارانی یەهودی و مەسیحی و لە نێوان (شاری شەیتان)دا کە دەستەیەکن لە وثنیە هاوچەرخەکان و ئەوانەی پێشوودا ئەمەش واتە ئەم ململانێیە ئەوە دەردەخات و بەوە کۆتایی دێت کە شاری (خودا) بەسەرشانی (شەیتان)دا سەرکەوێ، واتە ڕووخاندنی شاری دووەم. مێژوونوسە مەسیحیەکان ڕێگای (توکوتیدس (پولیبیوس)یان گرتەبەر لە پشکنین و تۆمارکردندا، لەبەرئەوەی هەڵوێستی ڕەخنەگەر بۆ ئەوەی لە تەوراتدا هاتووە، هەروەها شێوازی (هیکتیوس) بۆ لابردنی ئەفسانە یونانیەکان چوونە دەرەوە بوو لە بیروباوەڕ، هەر بۆیە کتێبە دینیەکان بە شێوەیەک ڕاڤەکاندن ڕاڤە دەکرد کە لێڵی و شاراوەیی پێوە دیاربووە ئەم شێوەیە بووە ئەلتەرناتیڤێك بۆ شیکردنەوەی شێوازی ڕەخنەی پێشوو، ئەم ڕێگایە هەڵبژێردرا بۆ ڕاڤەکردنی دیکۆمێنتە مێژوویی‌یەکان، مێژووش کرا بە دوو بەشەوە،

١-مێژووی دینی پیرۆز

٢-مێژووی دنیایی

لە ڕاڤەکردنی مێژووی دینی پیرۆز ڕێگای ڕەمز درایە بەر کە بە گرانی بڕوای پێدەکراو بتوانین تێی بگەین، بەو شێوەیە دین خۆی سەپاند بەسەر بیرکردنەوەی مێژوویی‌دا، سەدەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کۆن بە

گشی سەدەی دواکەوتوویی بیروباوەڕ بوو، ئەم دواکەوتنەش کاریگەری هەبوو لەسەر هەردوو نوسەرانی وثنی و مەسیحی وەك یەك.
بەناوبانگترین ئەو کتێبانەی کە دەرچوون (حولیات)ی (ئیزیبیوس بامفیلوس ٢٦٠-٣٤٠) ئەسقەفی قەیسەری بوو، بۆ ئەوەی نوسی کە نوسینەکەی ببێتە پێشەکیەك بۆ میژووی کلێسە، کە بە زمانی یۆنانی نوسرابوو کە لەو سەردەمەدا زۆر کەس نەیدەزانی بیخوێنێتەوە، تەنها هەندێ زانای ئیمپراتۆری ڕۆژئاوا نەبێت کە دەیانزانی بیخوێننەوە، وا پێویست بوو بگۆڕدرایە سەر زمانی لاتینی ئەو ئەرکەی زانای بەناوبانگ (جیرۆمی باوك) سالی ٢٧٨ پێی هەستا) لەو سەردەمەدا ئەوەش پێویست بوو کە کتێبی میژوویی جیهانی دەربکرێ کە بەرگری بکات لە مەسیحیەت دژی وەثنیەکان بۆ لابردنی ئەو تاوانانەی خرابو ە سەر مەسیحیەت بە تایبەتی ئەو تێکشکانانەی کە بەسەر دەولەتی ڕۆمادا هات کە بەرپرسیارێتیان خستە ئەستۆی مەسیحیەت. ئەوەشی بەو ئەرکە هەستا (بولوس ئوروزیوس ٣٨٠-٤٢٠) بوو کە کەرەستەکانی ناوی لێ نا (حەوت کتێبە میژوییەکەی دژی وثنیەکان) (ئوروزیوس) یەکێك بوو لە یاریدەدەرانی (قەدیس اغسطین) دەستەپاچەیی میژوونوسان بۆ ئەوە گەڕایەوە کە نەیانتوانی شیکردنەوەیەکی قول بکەن دەربارەی ئەو پالنەرانەی کە کاری کردە نێو ئەو بزوتنەوە دینیەدا کە خۆیان وەسفیان دەکرد، هۆکاریش ئەوەبوو کە خۆیان بە پەرچوو

دەنگ و باسی خورافەو شەهیدەکان و قەدیسەکانەوە خەریك دەکرد، یەکێك لە بایەخدارترین کتێب کە لەو سەردەمەدا دەرچوو (دان پیانانەکانی قەدیس اغسطین) بوو،

## نوسینی مێژوویی لە سەدەی ناوەڕاستدا :

نوێنەرانی نوسەرانی مێژوو لە سەدەی ناوەڕاستدا لە پیاوانی ئاینی بوون لەبەرئەو هۆیە بێژوو لە دیدی دینەوە دادەڕێژرا، زۆربەی نوسەرانی مێژوو لەو سەردەمەدا شارەزاییان هەبوو بۆ ئەدەبی کلاسیکی و لاهوتی کە شێوەی مێژوونوسانی سەردەمی مەسیحی نوێی پێوە بوو، ئەو مێژوونوسانە زۆر بە خێرایی بڕوایان بە شت دەکردو بەدوای وردبینی ڕووداوەکاندا نەدەچوون واتە خۆش باوەڕ بوون هیچ جوداوازیەك لە نێوان بوویەرو خەیاڵدا نەبوو یان ڕاستی مێژوویی و ڕاستی شیعردا، داستانە شیعریەکان ببونە سەرچاوە مێژوویی یەکان، بە هیچ شێوەیەك ڕاستی یەکان ئاشکرا نەدەکراو

پڕوپوچەکانیش نەدەخرایە بەر ڕەخنە چونکە دیکۆمێنتە ساختەکان خزمەتی مەسەلەیەکیان دەکرد کە مەسەلەی سەردەم بوو، لەبەرئەوەی پێداوستییەکان وایان دەویست، بەرەلایی دەستی پێکردبوو، دوای ڕوخاندنی شارستانیەتی ڕۆما تاریکی بالی خۆی کێشابوو بەو سەردەمەدا، بزوتنەوەی هزری کوژاندبۆوە، نەزانی و دواکەوتن تەشەنەی کردبوو، توندڕەوی دینی تەسك وایان کرد کە هەندێك لە کتێبخانەکان داگیربکرێت و کتێبە زانست و بەهاکان بسوتێنرێن، ڕەهبانەکان چینی زاناکان بوون لە ئەوروپا، بەرژەوەندیە ئاینی و تاکەکان وایان کرد کە ببنە کۆسپ لە بەردەم ڕەوڕەوەی مێژوودا، زۆربەی مێژوونوسان بە پیاهەڵدانی پادشاو کڵێسەدا دەیان نوسی یان لە پێناو خانەوادەیەکدا دەیان نوسی یان مەزهەبێك لە مەزهەبەکان.

## نوسینی مێژوو لە سەردەمی ئیسلامدا:

لە سەرهەڵدانی ئیسلامدا عەرەبیش بەشێکیان هەبوو لە دەنگ و باس و ڕووداویی مێژوویی کە ڕاستی و ئەفسانەی تێکەڵاو بووبوو، لەبەر نەبوونی تۆمارکردنیان ئەم دەنگ و باسانەش پێی دەوترا (ایام العرب) و جەنگەکانی پێش ئیسلام و هەندێ هەواڵی نەتەوەکانی پێشوو وەك /عاد/ ثمود/ طسم/ جدیس/، هەروەها دەنگ و باسی تەورات و تلمود، نوسین لە سەردەمی جاهلی عەرەبدا زۆر بڵاو نەبووەوە نەزانراویش نەبوو ئەوەی بەربڵاو بوو وەك نوسینی پەیمان و بەڵێن نامەو صك و نامە، بەڵام عەقڵیەتی جاهلی تەنها شیعری بەلاوە گرنگ بوو بۆ چارەسەرکردنی نوسینی مێژوویی شانازیی‌یان بە عەرابایەتی خۆیانەوە دەکردو ڕقیان لە نەتەوەکانی تر بوو، ئەمەش وای کرد زیاتر خەڵك هانابەرن بۆ شیعر نووسین چونکە سۆزێکی دەمارگیری تیا بەدی دەکرا دژی نەتەوەکانی تر لە هەمان کاتدا لەمپەرێك بوو لە بەردەم بەرەو

پێشەوە چوونی مێژوو لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامدا موسڵمانەکان بەهۆی فەتح و جەنگ و داگیرکردن توانیان جێ پێی خۆیان جێگیر بکەن و شورایەك بۆ خۆیان دروست بکەن و کەمێك جێگیری بە خۆیانەوە ببینن بەمەش موسڵمانەکان توانیان لەو ساتەدا هەندێ ڕووداوو دەنگ و باس تۆماربکەن، بە تایبەت کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرو ڕاڤەکردنی قورئان، زۆربەی مێژوونوسانی ئیسلام بە شێوەی ڕەسمی نەبوون کە دەوڵەت ڕایان بسپێرێ بۆ گەڕان بە دوای دیکۆمێنتەکانداو هەروەها نوسینەوەی مێژوو، دانراوە مێژووییەکانیان بۆ گشت ئیسلام بوو واتە پشتیان بە هاوکاری دەوڵەت نەدەبەست، سەرەتا مێژوو ئاوێنە بوو بە گێڕانەوەی فەرموودەکان و ڕاڤەکردنی قورئان، لەبەرئەوەی کاتێك موسڵمانەکان خەریك بون بە کۆکردنەوەی قورئان و ڕاڤەکردن و جیاکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر پێویستیان بە لێکۆڵینەوە هەبوو بۆ ئەو بۆنەیەی کە ئایەتەکان دەهاتنە خوارەوە، بۆیە پێش هەموو شتێك هەستان بە کۆکردنەوەی دەنگ و باسی ژیانی پێغەمبەر، بە پەرۆشی ئەوە بوون کە تێبگەن لە بڕیارو هێماکانی چونکە کرایە بناغەیەك بۆ ژیان و دین، بۆ ئەوەش فەرموودەکانیان کردە پاڵپشت و هەموو فەرموودەکانیان کۆکردەوە کە گوێ بیستی دەبوون، جیاوازیان لە فەرموودەکاندا بەدی دەکرد، بۆ ئەوەش خۆیان خەریك کرد بۆ جیاکردنەوەی فەرموونە ڕاستیەکان و فەرموودە هەڵبەستراوەکان، لە

قورئاندا ئاماژە بۆ نەتەوەکانی ترو تیرەکانی ترو پێغەمبەرانی دیکە دەکات، موسڵمانەکان دەیانویست ئەو هێماو ڕەمزانە تێبگەن، بەچوونە لای یەهودو نصاریەکان بۆ لێك دانەوەی هێماکان ئەوانیش لێك دانەوەی تەورات و تلمودیان بۆ دەکردن موسڵمانەکانیش ئەو لێك دانەوانەیان بەکار دەهێنا بۆ ڕاڤەکردن و بۆ مێژوو. کە بە ناوی (ئیسرائیلیات) ناو دەنرێ، یەکێك لە پێشەوایان (کعب الاحبار) بوو کە ساڵی (٣٤هـ) مرد هەروەها (وهب بن منبه) کە ساڵی (١١٠هـ) مرد، ئەو هۆکارانەی کە یاریدەی نوسینی مێژوویی‌دا سیستەمی دارایی حکومەتی ئیسلامی بوو ئەویش بەهۆی ڕووداوە سیاسی‌یە داگیرکردنەکاندا کە ئیسلام پێی هەڵدەستا ئەو هۆکارانەش هوشیاری مێژوویی ووروژاند لای موسڵمانەکان و وای کرد کە نوسینی مێژوویی زۆر بێت، سەرەتا تۆمارکردنی هەندێ دەنگ و باس کە لە سەر زاری خەڵکەوە دەبیسترا یان لە شێوەی نامەدا بوو، ئەویش لە سەردەمی معاویەدا، تا ئێستا نەزانراوە یەکەم دانراوی کتێب لە مێژووی ئیسلامدا کێ بووە، بەڵا، پێشکەوتوتریان ئەم چوار نوسەرە بوون، (زیاد بن ابی- ٥٣ هـ مردووە) (دغفل) و (عبدالله بن عباس) و (عبدالله بن شریه ٧٠ هـ مردووە) ئەمانە لە شێوەی کۆڕو کۆمەڵدا ڕاڤەی قورئانیان کردووە، زۆربەی نوسینەکانیان شێوەی نوسینی مێژوویی وەرنەگرت بەڵکو بەشێوەی قسەو دەنگ و باس بوو بۆیە گومان دەکرا لە نوسینەکانیان ئە

کتێبانەش پێش نوسینەوەی مێژوویی بوو، دوایش کتێبێ کە هەمووی دەربـارەی ژیـانی کەسـایەتی‌یەکان بـوون کـە ئـەویش دوور بــوو لـە نوسینەوەی مێژوویی‌یەوە، بە تایبەتی نوسینەوەی ژیانی پێغەمبـەر و فەرموودەکانی، هەرئەوەش بووە هۆی بەرزکردنەوەی نوسینی مێژوویی کە ئەو شێوە نوسینەش شێوەیەکی پەیوەندی کردنی دیاری دەکرد لە نێوان گێڕانەوەی فەرموودەکان و نوسینەوەی مێژوویی کە کاریگەریی هەبوو بۆ ڕەوتی مێژوونوسانی ئیسلام کە بەو شێوەیە مێژوو بنوسن، زۆربەی نوسینەکانی مێژوونوسانی عەرەب دەربارەی ژیانی پێغەمبـەر بـوو ئـەویش لـە ڕێی دەمـاو دەمــەوە یـان جەنگـەکانی ئیسـلام دژی نەیارانیان کـە لـە شـێوەی چیرۆکی مێژوویـی‌دا دەنوسـران نـەك لـە دووتوێی مێژوویی‌دا، وەك (إبان بن عثمـان بـن عفـان) لـە سـاڵی ١٠٥ کۆچی کردووە) یان (محمد بن مسلم الزهری ١٢٤ کۆچی کردووە)، (ابن اسحاق) شێوەیەکی تری وەرگرت بۆ نوسین بەهۆی هاتوچۆی بۆ وڵاتانی دی و کۆکردنـەوەی زانیـاری ئەوکاتـەی چـووە لای (خلیفـە منصـور) و پێی وت (برۆ کتێبێك دابنـێ هەر لەوکاتەوە کە خودا ئادەمی دروست کـردووە تـا ئـەمڕۆ) کاتـێ (ابـن اسـحاق) کتێبەکـەی تـەواوکرد (خلیفـە منصور) پێی وت (درێژەت پێداوە برۆ دایبڕێژەرەوەو کورتی بکەرەوە)، خلیفە منصور کتێبەکەی لە گەنجینەکەیدا هەڵ گرت، کتێبەکەی (ابـن اسحاق) سەرچاوەکەی ڕووداو و دەنگ و باسەکان بوو، کاتێك لە مەدینە

بوو کۆی  ەکردنەوە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی ڕایەکان لە یەک نەدەچوون و جیاوازیان هەبوو بەڵام لە لایەنی مێژوویی و ئەدەبییەوە شوێنێکی گەورەی  ەبوو بایەخێکی بەرزیشی هەبوو، لە سەدەی (٢)ی کۆچیدا پێشکەوتووترین نوسەری عەرەب (علی بن  محمد المدائنی) بوو (١٣٥-٢٢٥ کۆچی) کە کتێبێکی دەربارەی دایکەکانی پێغەمبەر داناو کتێبێکی دەربارەی منافقین و کتێبێکیش دەربارەی سەردەمەکانی  پێغەمبەر دانا، هەروەها دەربارەی خوڕەوشتی پێغەمبەر و دەربارەی خەلیفەکانیش دەربارەی شیعری عەرەب و فەتحەکانی عێراق و شام، دوای ئەوانیش دەیان مێژوونوسی تر سەریان هەڵدا وەك (الطبری/ الیعقوبی/ المسعودی/ مسکویە/ ابن خلدون) کە ئەمەی دواییان باسێکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەین لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی زانستیانە مێژووی عەرەب و ڕاڤەی بۆ مێژوو هۆکارەکان نوسیوە.

دووەم تایبەتمەندێتی کە مێژووی ئیسلام پێی ناسرابوو ئەویش (الاسناد) پاڵپشت بوو واتە گەڕانەوەی دەنگ و باسەکان بۆ شایەتێکی بەرچاو، لە سەردەمی مێژوونوسی گەورەدا (الطبری) خەڵکان گوێیان بۆ مێژوو ڕادەگرت لە زاری (الطبری)ەیەوە ئەو زانستەی کە لە کتێبەکاندا بوو وەلانران بەهۆی زانستی گوێ بیستی، ئەمەش بزوتنەوەی تۆمارکردن و نوسینی یەك خست، لەبەرئەوەی کتێب لای گوێ گرو لەبەرکەر بایەخی خۆی نەما، دوایش باوەڕهێنان بەوەی کە کتێب و

دیکۆمێنتەکان اعتمادیان لەسەر نەبوو چونکە دەتوانرا تەزویر بکرێت، قورئان وای پێویست کرد کە ببێتە مەعریفە لەسەرویانەوە مەعریفەی مێژوویی، چونکە قورئان ئاماژە بۆ ئەو ڕووداوانە دەکات کە هاتونەتە خوارەوە لەسەردەمیدا، دوایش گەڕان بەدوای زانینی ئەو بۆنانەی (اسباب النزول) کە ئایەتەکانی تیادا دابەزیوە، دەیانزانی ئەو بارودۆخە چی‌یە کە ئایەتەکان بۆی دەهاتنە خوارێ ئەمەش وای لە ڕاڤەکاران کرد کە پێویستی یان بە مێژوو بێت هەروەها ئەو بارودۆخە بێت کە ئیسلام تیایدا لەدایك بوو تا بتوانن باشتر قورئان بخوێننەوەو جوانتر تێ‌ی بگەن، چونکە لە قورئان ئاماژە بۆ نەتەوەی تر دەکات و هەروەها ئاماژە بۆ پێغەمبەرانی تر دەکات وەك مێژوو، بۆ ئەوەی زیاتر زانستی تر بن دەگەڕانەوە سەر نوسراوی مەسیحیەکان و یەهودیەکان بۆ زیاتر زانین، گەڕانەوەش بۆ ئەو کتێبە کۆنانە لەکاتی خۆیاندا قەدەغە نەبوو، بەلام لە هەمان کاتدا خەڵکیان بۆ ئەوە هان دەدا، هۆی بەرفراوانی مێژوو دەگەڕایەوە بۆ ئەو خەلیفانەی کە حەزیان دەکرد گوێ لە هەواڵی پادشاکانی پێشوو بگرن تا ئەزموونیان لێوە فێربن و فێری ڕامیاری بن، (مسعودی) دەڵی (معاویە هەموو شەوێك گوێ‌ی لە هەواڵی ڕۆژانی عەرەب و عەجەم دەگرت) هەروەها (خەلیفە منصور)یش بە هەمان شێوە دەیویست سوود لە مێژووی کۆن وەربگرێ، (روبرت فلنت) لە کتێبەکەیدا (مێژووی فەلسەفەی مێژوو) دەڵێ (نوسینی مێژوویی لای

عەرەب خاڵی نەبووە لە دەنگ و باسی باش بەڵام نەیتوانی بکاتە قۆناغی جیهانی یان فەلسەفی. ئەوانەشی گەشتنە چارەسەریێ بۆ نوسینی مێژوو نەگەیشتنە ئەو قۆناغی وەسف و گێڕانەوەی حولی)، ابن الاثير (١١٦٠-١٢٣٢) ویستی بکاتە هۆکاری سروشتی بۆ نوسینی مێژوو لەوەش زیاتر تێنەپەڕی (ابن خلدون) بووە خاوەنی تیۆرێك لە مێژووداو توانی تویژاڵێك وەرگریێ لە فەلسەفەی مێژوویدا، تەنها ئەو توانی چۆن خزمەت بکات لە ڕێگای لێکۆڵینەوە، (بارتر) دەڵێ (ابن خلدون توانی بکاتە قۆناغەکانی سەردەمی مێژوونوسانی مەسیحی لە سەدەی ناوەنجیدا لە تێگەیشتنی بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ و ڕۆشنبیری.

## ( ابن خلدون ) و فەلسەفەی مێژوو:

(ابـن خلــدون ۲۷/٥/۱۳۳۲- ۱۷/۲/۱٤۰٦) مێژوونـوس و توێـژەرەوەی عەرەب و فەیلەسوف و زانای سەردەمی خۆی بـووە، (ابـن خلـدون) بـە شێوەیەکی دی سەیری ڕووداوەکانی دەکرد، لـە باری ناوەوەو لـە باری دەرەوەی دەکۆڵیەوە، بە مانایەکی تر ڕووداوەکانی لە دەرەوەو لە ناوەوە ڕاڤە دەکرد لەیەك کاتدا بۆ ئەوەی هۆکارەکانی بۆ دەربکەوێ و ئاکامێکی باش بەدەست بهێنێ لـە یاسا گەردوونی و ڕاڤەی دیـارده کـە ڕێڕەوی مێژوونوسـانی خۆی نەگرت و ئەو سنوورەی پچڕاند، مێـژوو لای (ابـن خلدون) سەیرکردن و پشـکنین و هـۆو زانینـە بـۆ چۆنیـەکانی بوویـەرو هۆکارەکان، سەرەڕای ئەوەش هونەرێکە کە ئەوە بۆ ئەوەی دەگوێزێتەوە، لەو بارەیـەوە (ابن خلدون) دەڵێ (مێـژوو هونەرێکـە لـە هونـەرەکان کـە نەتـەوەکان و نـەوەکان بەشـداری تێـدا دەکـەن) بـەڵام ئـەو پرۆگرامـە زانستی‌یە کە کردیە پاڵپشتی خۆی لە دۆزینەوەی ڕاستیەکان مێژووە کە

پەیڕەوێ ی تێخوێنـدی (الاسـتقرائی) گرتـە بـەر کـە جـەخت لەسـەر پێویسـتی پـەیوەندی دەکاتـەوە لـە نێـوان ڕووداو لـە نێـوان هـێزو شـیکردنەوەو هۆکـارو ئاکامدایـە، بەمـەش تەنـها دەنـگ و باسـی نەدەگوێزایەوە بەڵکو شیکەرەوەو ڕەخنەگرێکی وردبین بوون ئاماژە بۆ مێژوونوسانی پێش خۆی دەکات وەك (المسـعودی) و (ابـن جیـان) لـە بارەیانـەوە دەڵـێ کـە مێژووەکـەیان باوەڕپـێکراو بـوو لـە هـەمان کـاتدا زانسـتی و وردبـین بـووە، بـەڵام ئـەو مێژوونوسـانەی دوای ئـەوان بـە گوێـزەرەوەو لاسـاییکەریان دادەنـێ، دوای ئـەوەی (ابـن خلـدون) لێکۆڵینـەوەی لەسەرکردن بۆی دەرکەوت کە بازنەیەکی ون لە مێـژووی عەرەبدا هەیە ئەویش هات ئەو ڕووپۆشەی لەسەر مێژوو و چیرۆکەکان لابرد بۆ ئاشکراکردنی ئەوەی ئاشکرا نەبوو، لەو بارەیەوەشەوە دەست پاك بوو لـەو ڕووداوو مێژووانەی کە دەینوسـییەوە، ئامـاژەی بـۆ ئـەو هۆیانـە کـرد کـە مێـژوو دووردەخاتـەوە لـە ڕاسـتییەکان وەك )تشـیع) و ئـارای مەزهـەبی و نـەزانی و هـەروەها چەواشـەکردنی ڕاسـتیەکان و پێداهەڵدانی درۆیانە بۆ ناڕاستییەکان، (ابن خلدون) هەڵوێستی خۆی وەرگرت لە بەرامبەر مێژوو ئەویش لە ڕێی (الاستقراء) بوو کە هـەوڵیدا هۆکان بە هۆکارەکانەوە پـەیوەند بکات و شـیکردنەوەی ڕووداوەکـان لـە شێوەی دەرەکی و نـاوەکیدا ببینێتـەوەو هـەروەها سـەیرکردنی ڕێڕەوی ڕووداوەکان و پوختەکردنی یاساکان و سونەتەکان، جەختی لەسەر ئەو

پەیوەست بوونانە دەکردەوە بۆ نوسینەوەی مێژوو بۆ ئەوەی مێژوونوس ڕاستگۆ بێت و مێژووەکەی نزیك بێت لە ڕاستی‌یەوە، لەبەر ئەوەشە کە (مقدمە)ەکەی شێوەیەکی زانستی پوختی وەرگرتووە لە پێناو گەڕان بە دوای هۆکارە ناوەزیـەکان کـە کاریگـەریان هەیـە بـۆ ڕەوڕەوەی ڕووداوە مێژوویی‌یـــەکان و هـــەروەها دیـــاری‌کردنی چۆنایـــەتی ڕاســـتی‌یە کۆمەلآیەتی‌یـەکان کـە خـۆی لـە دروسـتبوون و پێشـکەوتن و نـەمانی دەوڵـەتدا دەبینیـەوە، پەیڕەوی مێـژووە نوێکەی سنووردار کرد کەوای لێکرد یاسایەکی تایبەت بۆ ڕاڤەی مێژوو دابنێ، ئەمەش بۆ زۆربەی ئەو مێژوونوسانەی کە لە سەردەمی ئەودا مێژوویان دەنوسیەوە بۆ ئەوەی مێژوونوسـان سـیفەتی مێژوونـوس وەرگـرن و بـەزیرەکی و ڕۆشـنبیری فراوانـەوە مێژووبنوسنەوە، بەلآم ڕێزمـانی نوسیـنی مێـژوو کە خـۆی لـە تێرامان و (الاتسقراء) و لێکۆڵینەوەی ڕاستی و بینین و دەرك پێکردن و ئەزموونگـەری هـەروەها جیـاوازی سـەیرکردن بـۆ ڕووداوەکـان لـە چوارچێوەی زەمـەنیدا، سـەیرکردن بـۆ هۆکارەکـان تـەنها بـە مێـژوو نابێ بـەڵکو بـەهۆکاری کۆمـەلآیـەتیش، مێـژوو بـە زانسـتێ دانـا لـە زانسـتی فەلسـەفە لەبەرئـەوەی کـە ڕووداوەکـان شـی‌دەکاتەوەو بـە یەکیانـەوە دەبەستێ لەگەڵ جیاوازی دەنگ و باسـە ڕاسـتگۆکان و دەنـگ و باسـە درۆکـان، هـەروەها هەڵسـەنگاندن لـە نێـوان هۆکارەکـاندا، مێـژووی بەشێوەیەك لە شێوەکانی کۆمەلآیەتی مرۆیـی دادەنا لەبەرئەوەی مێژوو

وەسفی دەوروبەری کۆمەڵایەتی دەکات کە سیاسەت و جەنگ و هونەرو زانست و پیشەسازی بازرگانی و دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و ئابووری و دین دەگرێتە خۆ، ئەو هەموو دیاردانە کاریگەری دەکەنە سەر ڕەوتی مێژوو یان بەشێوەی ئیجابی کە زیادکردنی زانیاریە بۆ ڕاستیەکان و پیاهەڵدانیان یان بەشێوەی سلبی بۆ لابردنی هەندی زانیاری و کورت کردنەوەیان و نەچوون بەلای هەندێ ڕاستیداو دیاری کردنی هەندێك لە هەندێکی تریان، لەو بارەیەوە (ابن خلدون) دەڵێ (ئەگەر روایەی مێژوویی تەنها پشت بە گوێزانەوە ببەستێ و بڕیارنەدا بە نەریتی بارداو ڕێزمانی سیاسەتداو سروشتی عمرانداو هەواڵی نێو کۆمەڵی مرۆییدا هەروەها پێوانە بۆ غائب و بەرچاو نەکات و ئێستاو ڕۆیشتوو نەکات لەوانەیە بڕوایی تێدا نەبێت لە دەست کەوتن و پێشکەوتن و ڕاستگۆییدا)، هەر بۆیە (ابن خلدون) جەخت دەکاتەوە کە دەبێ مێژوونوس لە هەموو زانیاریەك شارەزایی هەبێت، بەلام تەنها روایەی دەنگ و باسەکان بزانێ ئەوا تەنها چیرۆك نوس دەردەچی، مێژوو لای (ابن خلدون) دوو ڕووی هەیە: ڕوویەکی دەرەکی و ڕوویەکی ناوەکی کە جیاوازن لە یەکتری، دەرەکی مێژوو وەك خۆی دەڵێ (تەنها خۆی لە ڕووداوی ڕۆژانەی دەوڵەت و پێشینەی سەردەمەکانی پێشوو دەبینێتەوە ئەو دەنگ و باسانەی کە قسەو ڕووداو چیرۆك و کەسایەتیەکان دەگرنەخۆ)، بەلام ڕووی دووەمی ناوەوە (ناوەکی) بۆ

مێـژوو (کـە خـۆی لـە لێکۆڵینــەوەو شــیکردنەوەی بوونــەوەرەکان و ڕووداوەکان و زانینی هۆکارەکان و هەروەها هۆی بوونیان و گۆڕینیان لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر) لەبەر ئەوەشە کـە مێـژوو بابەتێکـە لـە ڕەگەزو حیکمەتدا خۆی دەبینێتەوە کە لە ئەزموونداو هەروەها هەوڵ دان بۆ زانینی بوونی شتەکان و سروشتی ڕووداوەکان کە کاریگەری هـەبوو بۆ سەر مرۆڤ و کۆمەڵەکەی. پەیڕەوەکەی لە مێژوودا پشت بە ڕەخنەو لێکۆڵینـەوەو تێبینـی دەبەسـتێ واتـە ڕەخنـە لـە دەنـگ و باسـەکان بـە شێوەیەکی زانستی هـەروەها ڕەخنـە لـەو ڕێبازانـەی کـە مێـژوو نوسـان بۆیـان ماوەتـەوە لـە لێکۆڵینـەوەی ڕوایەتـەکاندا، ئەمـەش هـەمووی بـۆ ئەوەی مێژوونوسـان نەکەونـە نـاو هەڵـەوە وەك ئەوانـەی پێشـوو تـێی کەوتون، چونکـە زۆربـەی ڕاڤـەکاران و مێژوونوسـان کەوتنـە ئـەو هەڵـە مێژووییانـەوە ئـەویش بـەهۆی ئـەوەی تەنـها پشـتیان بـە گوێزانــەوە دەبەست، ئەو هۆکارانـە دەست نیشـان دەکات کە مێژوونوسان کەوتنە هەڵەو درۆ لە دەنـگ و باسـەکاندا کـە لـەم خاڵانـەی خـوارەوەدا دیـاری دەکات.

١-مەیل کردن بۆ ڕۆژگارو چوونە ژێر باری ئاراو مەزهەبەکان.

٢-خۆبردنــە پێشــەوە لای ســوڵتانەکان بــە مەبەســتی گەیشــتن بــە مەرامەکان.

٣-وەرگرتنی هەواڵەکان و گێڕانەوەی بەوپەڕی متمانەوە.

٤-نەزانینی سروشتی ئەحواڵ لە عیمراندا.

ئەو مەرجانەی کە دەبێ لە مێژوونوسدا هەبن بۆ ئەوەی دوور بکەوێتەوە لە وەسفدا کە مێژوونوسانی پێشوو پێوەی ناسرابوون ئەویش گواستنەوەی دەنگ و باسە بێ بیرکردنەوە:

١-زانینی سروشتی عمران و کاریگەری کردنە سەر مرۆڤ کاریگەری کردنە سەر ئاکارو ژیانیان، ئەو زانینەیش پێوستی بە دەرك کردن هەیە بە ڕێژمانی سیاسەت و سروشتی بوونەوەرەکان و ئەوامیس و عمران هەیە ئەمەش بە جیاوازی نەتەوەکان لە ئاکارو داب و نەریت و بەهاو مەزهەبەکان ئەویش بەهۆی جیاوازی شوێن و زەماندا.

٢-لێکۆڵینەوە لە دەنگ و باسەکان و ڕاستی ڕووداوەکان و هاوشێوەکردنی بۆ رادەربڕین لە ڕاستگۆیی‌یان، مێژوونوس ناتوانێ دەربچێ لەو کارەدا بێ‌ئەوەی ڕۆشنبیری‌یەکی فراوانی نەبێت دەربارەی مرۆڤ و تواناکاری بۆ پێشکەوتن، هەروەك خۆی دەڵی کە مێژوو دەنگ و باسی کۆمەڵایەتی مرۆیی‌یە کە ئەویش عمران لە جیهانداو ئەوەشی تووشی ئەو سروشتیە عمرانە دەبێ لە ئەحواڵی بەربەریەت و دەمارگیری و پۆلێن کردنی زاڵ بوونەکانی بەشەر بەسەر بەشەری تردا هەروەها ئەو ڕووداوانەی کاریگەری دەکەنە سەر عمران.

هزری فەلسەفە لای (خلدون) لەسەر ئەزموون و پشکنینی بەشێکی ڕاستیەکان و خوێندنەوەی ڕووداوە کەسێتی‌یەکان هەروەها ڕاستەوخۆی

گەردوون لە ڕێگای دەرك و ئارەزەوە كە وەك بناغەیەك وایە بۆی، وای دەبینی كە تیۆرو باوەڕە فەلسەفیە ئەبستكراتەكان كە دەزگایەكن لە لۆژیكی وێناندن سوودی نیە چونكە زانستێكی ڕاستەقینەیە لەبەر ئەوەی دوورە لە بوویەری بەرچاوی هەست پێكراو لەبەرئەوەی ئەو پێوانانە ناتوانن وای دابنێن كە دەگەنە ڕاستیەكان لەبەرئەوەی لە سروشتێكی ترە نەك ئەو سروشتە هەست پێكراوەی كە دەزانرێ بە بەرچاوو ئەزموونی، فەلسەفە لای (ابن خلدون) حیكمەت و لۆژیك دەگەیەنێ هەروەها جیاوازیە لە نێوان حەق و ناحەقدا، فەلسەفەكەی تەنها لێكۆڵینەوە لەسەر ئاوەزو ئەودیو ئاوەز ناكات بەڵكو بایەخ بە لێكۆڵینەوەی بوونەوەرە لاشەییەكانیش دەكات كە فەیلەسوفان ناویان لێنا بە (زانستی سروشتی) هەروەها لە فەلسەفەكەیدا لە دەرگای ئەوەش دەدات بۆ زانستی خودایی كە ناوی نا بوونەوەرەكان كە لەودیوو هەست و ڕوحیانەتەوەیە یان زانستی دوای سروشت، ئەو بوونە ڕۆحیانەتانە هەر وەك خۆی پێی وایە نەناسراوەو ناشتوانین پێی بگەین و بەڵگەی بۆ بهێنینەوە لەبەر ئەوەی داماڵینی ماقوڵەكان لە بوونەوەرە دەرەكیەكان ئەوەش ئەوەیە كە لەوانەیە هەستی پێبكەین یان دەركی پێبكەین، ئەوە وەلا دەنێ كە فەیلەسوفانی پێشوو دەربارەی خۆشی و ئارەزووەكان دەڵێن كە دەروون دەپێكی كە فەیلەسوفان وای بۆ دەچن كە خۆشی دەرك كردنە لە بوونەوەرەكاندا لە هەموو هەست پێ كراوو هەست پێ

نەكراودا، ئەوەش فەیلەسوفان بناغەی سەپێنراودكەیان بوو بۆ دۆزینەوەی تەنی ژێرەوە دوایی هەست دوای ئەوەش دەروون و دوایش ئاوەن، ئەو وای نابینێ كە خۆشی بە دەرك كردن بە بوونەوەرەكان دێتەجی وەك وای بۆ دەچن. بەڵكو لە كاتی دەرك پێكردنی بوونەوەرە تەنی و رۆحیەكانە لەبەرئەوەی مرۆڤ پێك هاتە لە دوو بەش یەكێكیان تەنی و ئەوی تریان روحانی كە پێوەی لكاوە، هەر بۆیە لەو دوو بەشە چوارچێوەی تایبەتیان هەیە دەرك كردن تیایاندا یەكێكە كە بەشێكە رۆحانی‌یە جاری وایە بە مەدرەكێكی رۆحانی دەركی پێدەكرێ و جاری وایە بە مەدرەكێكی تەنی دەركی پێ دەكرێ، بەڵام مەدرەكە روحانیەكان خۆیان دەرك بە خۆیان دەكەن بێ بوونی نێوەند (واسطە) مەدرەكە تەنی‌یەكان بە بۆنەی ئامێرە تەنیەكانەوە لە مێشكەوە بۆ هەست، بەڵام دەركی مرۆڤ بۆ بوونەوەرە تەنی و رۆحیەكان بەشێك لە گەشە پێدەدات كاتێ مرۆڤ رووناكی دەبینێ و دەنگی گوێ لێ دەبێ گەشەی پێدەكات، بۆ زانینی دەركی رۆحی بۆ شتەكان گەشەی زۆر بە مرۆڤ دەگەیەنێ لە ئارەزوو خۆشی وەك لە دەركی تەنی، (ابن خلدون) لە لایەنی فەلسەفەی مێژوو بە یەكەم كەس دادەنرێ كە لێكۆڵینەوە لەسەر بابەتی زانستی و شیكردنەوەی زانستی بكات لە كتێبە بەنرخەكەیدا (المقدمە) سەرەڕای ئەوەی كە فەرهەنگی فەلسەفەی مێژووی (Phliosophy of History) دیارنەكردووە، بۆ لێكۆڵینەوە لە بابەتی فەلسەفی مێژوویی هاوكێشەیی

دەكـات لـە نێـوان دیـاردە كۆمەڵایەتی‌یـە مرۆیی‌یـەكان و دیـاردە كۆمەڵایەتی‌یە ئاژەڵی‌یەكاندا هـەروەها هاوكێشە لـە نێـوان تاكەكەسـە درندەوكـان و پێشكەیشتووەكان دەكـات بە ئـاژەڵی درنـدەو مـاڵی دا، هەروەك پرۆفیسۆر (شمیت) پێمان دەڵێ (هەموو بونەوەرو دروست بووە زیندوەكان لە مرۆڤیشەوە كە ملكەچی یاساكانی گەشەكردن و پوكانەوە دەبن) ئەو یاسانە كە دەسەپێنرێ و پشتی پی دەبەسترێ لە راڤەكردنی سەرهەڵدان و ڕوخاندنی خێزان و ئیماراتەكان و ڕێكخراوە سیاسی‌یەكان و تەنانەت هونەرو ئەدەب و زانستیش.

فەلسـەفەكەی گرنگی‌یـەكی تایبـەتی هـەبوو بـۆ پراكتـیزەكردن لـەنێو كۆمـەڵی مرۆڤایـەتیدا بـە شـتێكی بناغـەیی دادەنـرا بـۆ تێگەیشـتن لـە قۆناغەكانی مێژوو كە كۆمەڵی مرۆیـی پـێ‌یدا تێ‌دەپـەڕێ. سوودی لەو شێوە لێكۆڵینەوەیـە كـردو یاسایەكی بناغـەیی داڕشـت كـە بزوێنـەری كۆمـەڵگا بەڕێوە ببات، ئەو یاسایەش یاسای سێ قۆناغە بـۆ كۆمـەڵگا هـەموو كۆمەڵگایـەك دەبێ بە ڕێگـای سروشـتی خۆیـدا تێ‌پەڕێ قۆنـاغی سـەرهەڵدان/ قۆنـاغی دروسـت بـوون/ قۆنـاغی گەشـەكردن و تـەواوبوون/ قۆناغی بزوتنەوەی كۆمەڵایەتی/ هەروەك خۆی دەڵێت لە ڕەوڕەوەیـەكی هەمیشەیی دایە كارەكانی خۆی بە شێوەیەكی ئامێری دەبات بەڕێوەو كۆتـایی نایـەت، كۆمەڵایەتی‌یـە مرۆی‌یـەكان ڕاناوەسـتێ و مردنـی كۆمەڵایەتیش یان نەمانی سیستەمی كۆمەڵایەتی ڕاناوەستێ بەڵكو ئەوە

خاڵێکی سەرەتایی و کۆتاییەیە، ئەویش وەك ئەوەیە کە کۆمەڵگایەك کۆتایی پێ‌دێت، ئەم قۆناغەش جیاوازیان هەیە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، هەندێکیان وەختێکی زۆر نامێننەوەو هەر بە ساوایی دەمردن و هەندێکیان لە کاتی پیریاندا بەربەرەکانی دەکەن و هەندێکیان بە لاوی دەمردن، (ابن خلدون) لە کتێبی (مقدمە)دا پەیوەندی نێوان تەمەنی تاکەکەس و تەمەنی دەوڵەت دیاری‌دەکات و سنووری قۆناغی دروست بوونیان و گەشەکردنیان کە تاکەکەس و دەوڵەت پێ‌یدا تێ‌دەپەڕن دیاری دەکات، وەك دەڵێ (ئەزانم کە تەمەنی سروشتی خەڵکان وەك پزیشکان ڕوونیان کردۆتەوە (١٢٠) ساڵە تەمەنی هەموو نەتەوەیەك بەپێی سەدەکانی جیاوازە یان زۆر یان کەم دەبێت بەو شێوەیە تەمەنی خەڵکانی سەدەیی‌یەکان (١٠٠) ساڵە هەندێکیان (٥٠) ساڵە هەندێکیان (٨٠) ساڵە یان (٧٠) ساڵە ئەوەش لە سەرو تەمەنی سروشتی زیاتر نابێ کە (١٢٠) ساڵە تەنها لە کاتی دەگمەندا نەبێت)، بەڵام تەمەنی دەڵەوتان، تەمەنی دەوڵەت ناتوانێ دەربچێ لە تەمەنی سێ نەوە، ئەویش تەمەنی کەسێکە لە تەمەنی نێوەند کە (٤٠) ساڵ دەبێت زۆرکات دەوڵەت ناتوانێ دەربچێ لە تەمەنی سێ نەوە لەبەرئەوەی ئەوەی یەکەم لەسەر (بەداوەت) و گرژیەکەیی و دڕندەیی‌یەکەی نەماونەتەوە، کە وێنەیەکی دەمارگیری پارێزراویان تێدایەو خەڵکانیش بۆیان ژێردەستەن، بەڵام ئەوەی دووەم ئەوەی

پادشاو خۆشگوزەرانی و شارستانیەتە، ئەویش ئەوەیە کە لە (بەداوەت)ەوە بۆ شارستانیەت لە گرژییەوە بۆ کراوەیی ئەمەش وای لێ دێ شێوەی دەمارگیری دەشکێنرێ و سیفەتی ملکەچ بوونیان تێدایە،
بەڵام ئەوەی سێهەم: سەردەمی (بەداوەت) یان لەبیر دەچێتەوە وەك ئەوەی کە بوبێت، خۆشی دەمارگیری ون دەکەن تا ئەوکاتەی دەگەنە ئارمانجی خۆیان لە خۆشگوزەرانی و دوایی دەبنە بار بەسەر دەوڵەتەوە، دەمارگیری دەڕووخێ و هەروەها بەرگری کردن و داواکردن لە بیر دەچێتەوە خۆیان بەڕۆشنبیرو سوارچاك و پیاوچاك دەخەنە بەرچاو بەڵام لە ڕاستیدا لە ژن بێ دەسەڵات تر دەبن، گەر داواکران بۆ بەرگری کردن ناتوانن بەرگری بکەن ئەو کاتە دەوڵەت پشت بە کەسانی تر دەبەستێ دوایش وای لێ دێ دەوڵەت ڕۆچێ و نەمێنێ. ئەم سێ ئەوەیە یەك لە دوای یەکە تەمەنیان (١٢٠) ساڵە. هەروەها دەڵی بۆ ئەوەی خانەوادەیك دەست بگرن بەسەر دەسەڵاتداو دەسەڵات بگرێتە دەست تەنها پشت بە هێزی سەرۆکەکانی نابەستێ بەڵکو پشت بە کۆمەکی کۆمەڵی یان پارتێك دەبەستێ کە دڵسۆزی بێت. زۆربەی دەوڵەتان بەو شێوە دەمارگیرییە تێپەڕیوون بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، کە بە یەکەم قۆناغ دادەنرێ کە هەموو دەوڵەتێك پێیدا تێدەپەڕێ، کە دەوڵەتیش دەگات گەشەی بالایی دەبی تووشی لاوازی و پوکانەوە بێت لە ڕای (ابن خلدون) هۆکارەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەم خالانەی خوارەوە.

١-هۆكاری ڕامیاری و سەربازی ئەمەش بۆ فراوان كردنی دەوڵەت و سەركردەش لێرەدا قورسایی‌یەك دەبینێ بۆ حوكم كردن وای لێدەكات كە سنووری بەرگری كردنی دەوڵەتەكەی زیاتر بكات ئەمەش پراكتیزە دەبێت لەو فەتحانەی كە عەرەب كردیان.

٢-هۆكاری تر دەگەڕێتەوە بۆ پلەی شارستانی لای تیرە داگیركەرەكان و تیرە داگیركراوەكان.

٣-ئەو جیاوازیانەی كە هەمیشە ڕوودەدات لە نێوان پادشاو ئەندامانی تیرەدان كە لەوێن، لە سەرەتادا پادشا دەرك بەوە دەكات كە قەرزاربارى پیاوانی تیرەكەیەتی بۆ دەسەڵاتەكەی. بۆیەش دەسەڵاتیان بەسەردا دابەش دەكات. بەڵام ئەوان تەماع دەیان گرێ و هەندێكیان نیەتی ئەوە دەكەن كە تەنانەت دەسەڵات بگرنە دەست و لە دەست پادشاكەیان بسەننەوە، بۆیەش پادشا ورد ورد دەسەڵاتەكەیان لێ دەسێنێتەوەو دەیخاتە نێودەستی بیانی‌یەوە ئەوانەی ملكەچ دەبن بۆ فەرمانەكانی پادشا لێرەشدا جیاوازی دروست دەبێت لە نێوان پادشاو ئەندامانی تیرەداو هەروەها لە نێوان ئەندامانی تیرەو بیانی‌یەكاندان ئەم جیاوازیانە دەبنە هۆی ڕووخاندنی دەوڵەت و نەمانی دەوڵەت.

٤-هۆكاری دەروونی و شارستانی كە پشت بەستنە بە خانەوادەی پادشاو خزم و كەس و كاریان بۆ گرتنی پلەی دەوڵەت بۆ ژیانی خۆش گوزەرانی كە ڕای لێدێ مەیلی سەربازی توندیان نامێنێ ئەمەش وای لێ

دێ کە ئەوانەی دڵسۆزی خانەوادەی پادشان وایان لێدێ کە نەتوانن یاریدەی دەڵەت بدەن لەکاتی مەترسیدا هەر بۆیە دەوڵەت دەڕوخێ و دەولەتێکی تر جێگای دەگرێتەوە.

٥-هۆکاری کۆمەلایەتی کەپەیوەندە بە گەشەی کۆمەلایەتی پێشکەوتنێك کە دەگاتە پلەی ترۆپك کە سروشتی خۆی ئاکامەکەیەتی. دوای ئەوە وردە وردە ڕوخاندنی کۆمەڵ دەست پێدەکات و ناتوانرێ ئەو ڕووخاندنە ڕاوەستێنرێ، (ابن خلدون) هەوڵ دەدات کە بەڵگە بهێنێتەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە خانەوادەی دەسەلات کە دەڕوخێ ناتوانێ خۆی ڕزگار بکات لەو ڕووخاندنە، ئەم ڕووخاندنەش لە تێگەیشتی (ابن خلدون) هێمایەکە بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵی دەسەلاتدار لە جێگای کۆمەڵێکی دی.

(توربنیرك) بایەخی (ابن خلدون)ی دەزانی کە دژی شێوەی (حولی) بووە لە نوسینەوەی مێژوودا، سەرەڕای ئەوە (ابن خلدون) بایەخێکی زۆری دا بە مێژووی سیاسی کە بە بەشێك لە مێژووی دەبینییەوەو بە بەشێکی دابڕی نەدەبنیی لەبەرئەوەی وا سەیری مێژووی دەکرد کە زانستێکە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی پێشکەوتنی ژیانی کۆمەلایەتی مرۆڤ دەکات ئەویش بە هۆی ڕووداوەکانەوە کە دەبنە هۆی گەشەکردنی مرۆڤ و پێشکەوتنی کۆمەڵ هەندێ لەو ڕووداوانە بەشێکی سیاسین، بەمەش ڕێگای نوسینی (حولی) لە مێژوودا وەلاناو دژی ڕاوەستا نەك وەك ئەو

مێژوونوسه عەرەبانەی کە بە ڕێگای (حولی) دەیان نوسی، پشتی زۆری بە تەورات و قورئان دەبەست لە دەرهێنانی زانیاری مێژوویدا، دەمارگیری .ینی پێوە دیار نەبوو وەك ئەوانەی لە سەردەمی خۆیدا ژیاون، بلیمەتیەکەی تەنها لە نوسینی مێژوویی‌دا نیە بەڵکو پێشەکیەکەیەتی بۆ مێژوو کەبلیمەتیەکەی تیایدا دەردەکەوێ، لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ و شیکردنەوەیەکی بێ سنووره لە ڕەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا هەر بۆیە (هامر بیرکستال) نازناوی (مونتیسکیو)ی ڕۆژهەلاتی پێدەدات، مێژوو لای (ابن خلدن) زانستێکە کە لێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەلایەتیەکان دەکات لە ژیانی مرۆڤدا، بەلام دۆزینەوەی بۆ مێژوو دەیگەڕێنێتەوە بۆ خودا، واتە خودا یارمەتی داوە بۆ دزینەوەی مێژوو لە ڕێگای ناوەزوو چاوی تێڕوانینەوە نەك لە ڕێگای سروشەوە، لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەیاندۆزێتەوە هەروەك خۆی پێی وایە لە ڕێگای ئاگاداری و تێڕامان و ئیلهامەوەیە، لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستی‌یە بلێین کە یەکەم هزرمەندە کە بڕوای وابوو کە زانست لە ڕێی بینین و ئیلهامەوەیە، هەر ئەوەشە وای لێکرد کە ببێتە پێشەوایانی مێژوونوسانی عەرەب سەرەڕای ئەوەی کە وشەی زانستی (Science) بەکارنەهێناوە بۆ لێکۆڵینەوەی چەمکی مێژوو بەڵکو لە جێگای ئەوە وشەی (معرفە– Knowledge)ی بەکارهێناوە کە مەبەستی زانست بووە ئەم ڕاستی‌یەش (طە حسین) بۆی ئاشکرا کردین کە بایەخی بە

لێکۆڵینەوە ئەدا لەسەر (ابن خلدون) و (ابـن خلـدون) ڕێبـازی زانسـتی سروشـتی بـەکارهێنا بـۆ لێکۆڵینـەوەی مێـژوو لـەوەش تێدەپـەڕی و مێژووی پەیوەند دەکرد بە زانستی لۆژیك و فەلسەفەو دوای سروشت و ماتماتیك دەتوانین بڵێین کە ئازایەتی‌یەکی گەورەی دەنواند لە ڕاڤەکردنی ڕاستی‌یەکان کە لەسەر بناغەی عەقڵانیەت بووە، (ابن خلدون) بەهۆکاری ناوەوەو دەرەوە ڕاناوەستێ بۆ ڕاڤەکردنی مێژوو بەڵکو دەچێتە دەرەوە بۆ بواری دەروونـی ئەمـەش (هیومـان فرانـك) و (طـە حسـین) ئامـاژەی پێدەکـەن هـەروەها دینیـش دەخاتـە نێـو بازنـەی ژیـانی کۆمەڵایـەتی مرۆڤـەوە، هـەروەها بایـەخ دەدات بـە لێکۆڵینـەوەی دەروونـی بەشـەرو دەروونـی کۆمـەڵ لـە لێکۆڵینـەوەی ژیـانی کۆمـەڵدا. لەبەرئـەوەی پەیوەندی‌یـەکی بـەهێز هەیـە لـە نێـوان بـواری دەروونـی و بـواری کۆمەڵایـەتیدا. هـەروەها مێـژووی لەگـەڵ کۆمەڵناسـیدا کۆدەکـردەوە لەبەرئـەوەی (ابـن خلـدون) وای بـۆ دەچـوو کـە مێـژوو زانسـتێکی کۆمەڵایەتیە زانستی کۆمەڵایەتیش مێژووە. لەبەرئەوەی بەیەکدا دەچن و ئاوێتـەی یـەکدی دەبـن چونکـە گـەر بـواری مێـژوو تەسـك بکرێتـەوە زیانی‌دەبێت بۆ مێژوو خۆی کە وای لێدەکات هاوکێشەو زانستی‌یەکەی تێك بدات، هەروەها جەختی لەسەر ئەو ڕاستی‌یە دەکردەوە کە زانست و ئـاداب و دیـن دیـاردەی کۆمەڵایـەتین و جیاوازیـان نیـە لـە دیـاردە کۆمەڵایەتیەکانی تر کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکردن.

# فەلسەفەی مێژوو لای هیگل:

فەلسـەفەی هیگـڵ وەك فەلسـەفەی شـیلنگ (١٧٧٥-١٨٥٤) وایـە فەلسـەفەیەکی ئایدیالیسـتی‌یە، هیگـڵ وای دەبینـێ کـە (هـزر Esprit) بنچینەی سەرەکیە بۆ دروست بوونی هەموو بوونێك، بەڵکو ڕۆحیەتی، مادەش خۆی شێوازێکە لە شێوازەکانی بوون و هزر، هیگڵ وای دەبینێ کە مێژوو تەنها هەر ئەوەیە کە ئەو بیرە گەردوونیە دەکاتەوە لە زەماندا، فەلسەفەی مێژوو خۆی ئەو مێژووەیە کە لە دیدی ژیری‌یەوە سەیر دەکرێ کە بوویەرەکان وەك خۆی دەبینێ، تەنها ئەو هزرەی بۆی زیاد دەکرێ ئەویش ئەوەیە کە (ئاوەز جیهان بەڕێوە دەبات)، بەڵام هیگڵ ئەو هزرە بە شێوەیەکی تایبەت تێی گەیشتووە کە دەربارەی لێکۆڵینەوەی لەسەر فەلسەفەی مێژووەوە کە (ئەنکساگۆر Anzxagore) یەکەم کەس بوو بەشێوەیەکی فەلسەفیانە بڕیاریدا کە (ئاوەز جیهان بەڕێوە دەبات) مەرامی ئەوە نەبوە کە ئاوەز ژیری خۆی هوشیار بکاتەوە یا وەك هزر بە

شێوەی هزرێك بەڵكو یاسا گشتییەكان، بزاوتنی سیستەمی هەسارە هەڵواسراوەكان بە پێی یاسای جێگیری بەڕێوە دەچن ئەو یاسایانەش خۆی هۆدۆزیانن، بەلام نەخێرو نە هەڵواسراوەكان كە بەپێی ئەو یاسایانە دەبزوێن ڕەت ناكرێتەوە، كەواتە ئەو ئاوەزەی كە مێژوو دەبات بەڕێوە لە دیدی هیگڵدا ئاوەزێكی ناهوشیارە تەنها چەند یاسایەكن كە ڕەوتی مێژوو سنووردار دەكەن و دیاریان دەكەن، ڕای خەڵكان كە فەیلەسوفانی فەرەنسی سەدەی هەژدەهەم پاڵنەرێكی سەرەكی بوون بۆ ڕەوتی مێژوو، بەلام هیگڵ وای دادەنا كە شتێكە شێوازی ژیان دیاری دەكات، یا بە شێوازێكی تر ڕەوشتی كۆمەلایەتی دیاریدەكات، بۆ نموونە لە فەلسەفەی مێژوویی‌یەكەیدا دەڵی هۆی ڕوخاندنی شاری (سبارتە) ئەو جیاوازی بووە لە نێوان ساماندا، هەروەها دەڵی كە دەوڵەت بەو شێوەیەی كە ڕێكخستنێكی سیاسی‌یە كە ڕەگەزەكەی تر جیاوازی سامان دەگەڕێتەوەو هەروەها خەباتی هەژارەكان دژی دەوڵەمەندەكان، بەڕای هیگل ڕەگەزی خێزان پەیوەستە بە پێشكەوتنی ئابووری گەلە سەرەتایی‌یەكانەوە، بە كورتی سەرەڕای ئەوەی هیگڵ ئایدیالیستی بووە بەلام وەك مێژوونوسە فەرەنسیەكان دەكەڕایەوە بۆ ڕەوشی كۆمەلایەتی بەوەی كە بنچینەیەكی قوڵە لە ژیانی گەلاندان هەر بۆیە هیگڵ دوانەكەوت لە سەردەمی خۆی بەلام بەسەریشیدا پێش نەكەوت، چونكە لە ڕاڤەكردن سەرچاوەی پاڵنەری كۆمەلایەتی كە دەڵی

(ڕەوشی کۆمەڵایەتی گەلێك لە سەردەمێکی دیاری کراودا ڕادەوەستێ، وەك ڕەوشی سیاسی و دینی و ئاکاری و ڕۆشنبیری و لەسەر ڕۆحی سەردەمەکەی، کە ئەمەش هیچ ڕاڤەیەك ناگەیەنێت، بەڵام هزر دەکاتە دوا پاڵنەر بۆ ڕەوتی مێژوو (کاتێك گەلێك لە پێشکەوتنیدا لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر بەڵام بەرهەمی نەبێت بۆ هزری ڕەها یان گەردون، ئەو گەلە تەنها دەبنە کەرەستە) پلەیەکی بەرزتری وەرگرت لە گەشەیدا، نمونەی ئەو ڕاڤانە هیچ هۆدۆزینکیان تیادا نیەو هیچ نادات بە دەستەوە، هیگل خۆی لە بازنەیەکی بۆشدا دۆزیەوە کە زانا کۆمەڵایەتی‌یە فەرەنسی‌یەکان تێی کەوتون ئەوان ڕەوشی کۆمەڵایەتیان بەو شێوەیە ڕاڤەکرد بە حاڵەتی هزرەکان و حاڵەتی هزرەکان بە ڕەوشی کۆمەڵایەتی.

# فەلسەفەی مێژوو لای سان سیمۆن:

سـان سـیمۆن (Saint- Simen ١٧٦٠-١٨٢٥) یەکێکـە لـە هـەڵگری سۆشیالیستەکانی پێش مارکس و یەکێکە لە دامەزرێنەری بنەمای سۆسیۆلۆژی لە نیوەی سەدەی بیستەمدا، ئەو وای دەبینی کە زانستی کۆمەلایەتی مرۆڤ (یان فیزیای کۆمەلایەتی هەروەك زۆرجار وا ناوای دەهێنێ) بۆ ئاشکراکردنی یاسا پێشکەوتنەکان پێویستە لە سەرمان کە ئەو ڕووداوانەی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤایەتی پێشوورەوە بیخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە، ناشتوانین کە پێشبینی بکەین بۆ پاشەڕۆژ ئەوەی کە لە ڕابردوو ئەگەین کەواتە دەبێ لە ڕابردوو بگەین ئەوجا دەتوانین پێشبینی بکەین. بۆ ئەوەی لە ڕابدروو بگەین. سان سیمۆن لە مێژووی ئەورووپای ڕۆژئاوا دەکۆڵێتەوە لە ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیاوە دەست پێدەکات لەو مێژووەدا خەباتی پیشەسازی دەبینێ (یان چینی سێهەم) دژی ئۆرستوکراتیەت، پیشەسازیەکان لەگەڵ مۆڵکدارەکاندا

هاوپـەیمان بـوون و پادشـاکانیان هـانی دەدان و پشـتیان دەگرتـن و کەرەستەی زاڵ بوونیان پێشکەش دەکردن بۆ دەست گرتنی دەسەڵات کە پێشووتر بە دەستی دەرەبەگەکانەوە بوو و بە ڕابەری ئەو شێوە خزمەت موڵکایەتیان پێ بەخشراو پارێزران و بەهۆی ئەو پاراستنەوە توانیـان سـەرکەوتن بەدەسـت بـهێنن بەسـەر دوژمنـەکانیاندا، پیشەسـازیەکان هـێزێك بەرەبەرە بەهۆی کـارو ڕێکخسـتنەوە هـێزێکی کۆمەڵایـەتیان بـۆ خۆیان پێکەوەنا کە بەسـەر هـێزی ئورسـتوکراتیەتدا بەرزتر بوون، سان سیمۆن شۆڕشی فەرەنسا تەنها بە لاپەڕەیەك لە ململانێی گەورە دەبینێ کەچەند سەدەیەکی خایاند لە نێوان پیشەسازیەکان و (نبـلاء)، خـەباتی پیشەسـازیەکان دژی چینـی (نبـلاء) کـە ململانـێی دوو بـەرژەوەندی دژبەیەك بوو، سـان سـیمۆن دەڵـی ئـەو ململانێیـە مێـژووی ئەوروپای ڕۆژئاوای پڕکرد، هـەر لـە سەدەی پانزەهەمەوە دەتوانین بڵێین ململانـێ بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتیە گەورەکان هۆکارێ بوون بۆ ڕەوڕەوەی مێـژوو لـەو ماوەیـەدا، سـەدەی هەژدەهـەمیش هەمان ململانـێ ڕوویدا لـە نێـوان بەرژەوەندی دژایەتیەکاندا کە لەو دژواریە بەرژەوەندیانـە ڕووی دا، سان سـیمۆن کاریگـەری زۆری کـردە سـەر بیرمـەندانی خـۆی بـە تایبـەتی مێژوونوسی فەرەنسی گەورە (ئۆگستین تیێری ١٧٩٥-١٨٥٦) خـۆی بـە کوڕی هەڵبژاردەی سان سیمۆن دادەنا.

## ڕاڤەکردنی (برتراند رسل)ی فەیلەسوف بۆ مێژوو:

فەیلەسوی ئینگیلیزی هاوچەرخ برتراندرسل) وای بـۆ دەچـێ کـە هـێز هۆکاری سەرەکی‌یە بۆ گۆڕانی ڕەوتی مێژووی بەشەریەت لەنێو سنوری نەتەوەیەکدا یان لەنێو نەتەوەکاندا، هێز لە لایەنی کۆمەڵایەتی‌یەوە بە ڕای (برتراند) وەك وزە وایە لە فیزیای هاوچەرخدا کە شێوەی جۆراوجۆر وەردەگرێ بە گوزارش کردنی لە خۆی، وزە جاری لە شێوەی تیشکدا دەردەکەوێ و جارێکیش لە شێوەی مادەو جارێك لە شێوەی هێزی ڕاکێشەر یان موگناتیسی دەردەکەوێ، لە کۆمەڵدا زۆرجار بە شێوەی جەنگی خوێناوی دەردەکەوێ جاری واش هەیە لە شێوەی جەنگی حزبیدا دەردەکەوێ جاری سێ‌هەم لە شێوەی پێشکەوتنی هونەری یان ئابوری.. هتد دەردەکەوێ.

# فەلسەفەی مێژوو لای مارکس و ئەنگلس:

مارکس و ئەنگلس زۆر لایەنی بیری هێگڵیان دەربارەی فەلسەفەو مێژوو وەرگرت دیوە ئاوەڕووەکانیشان هەڵگێڕایەوە ئەمان سەرتاپای ئاڵ و گۆڕی ژیانی مرۆڤ و بەرەوپێشەوە چوونی مێژوویان بەست بە بەرهەم هێنان و هۆنانیەوە کە جۆری جیاوازیان لە قۆناغی جیاوازدا لێ پەیدا دەبێت، گەشەدەکەن و ئینجا دەمرن تا ڕێگە بۆ لە هی خۆیان باشتر خۆش بکەن، یەك ڕێبازی بەرەوپێش چوونی مێژوو هەیە با شێوازو ڕووەکەشیشی جیاوازو ڕەنگاوڕەنگ بن جیاوازی لە نێوان گەلدا نیە هەریەکەیان دەتوانێت لەیەك جۆرباری ژیاندا بە گشتی‌یەك دەور ببینێت، خەباتی چینایەتی لایان بڕبڕەی ئاڵ و گۆڕی ڕووداوی مێژوویی‌یە. ئەنجامیشی وەرچەرخانی باری ئابووری و دەسەلاتی سیاسی‌یە کە لە چینێکی پاشکەوتووەوە دەچێتە دەست چینێکی پێشکەوتر، لە خاوەن کۆیلەوە بۆ دەبەرەگ و لە دەرەبەگەوە بۆ بۆرجوازی و لەوێشەوە بۆ

پرۆلیاریا. لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچونانەیادا مارکس و ئەنگلس زۆر ڕووی مێــژووی ئــەورووپای پێــش ســەرمایەداری و تایبــەت پــاش سـەرمایەداریان شـیکردەوە، وەك لـە کتێبـی (خـەباتی چینایـەتی لـە فەرەنسە)ی مارکس و (شەڕی جوتیاران لـە ئەڵـەمانیا)ی ئـەگلس و لـە گەلێك بەرهـەمی تریـاندا بەدی دەکرێت، بیروباوەڕی فەلسـەفی هیگـڵ و مـارکس و ئەنگلس ڕێگـەیان ۆ پێشـکەوتنی زانسـتی مێـژوو لـە جـاران خۆشکرد ئەوەی لە بەرهـەمی مێژوونوسـانی نیـوەی دووەمـی سـەدەی نۆزدەدا ڕەنگی دایەوە.

## سۆشیال یۆتۆپی‌یەکان و مێژوو:

تـێڕوانینی کۆمەڵایـەتی کـە سوشـیال یۆتۆپیـەکان خـاوەنی بـوون لـە سـەدەی هـەژدەو نۆزدەهـەمدا زۆر نزیـك بـوو لـە بـیروڕای ڕۆشـنگەرانی سەدەی هەژدە تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمان زیاتر بەلای جەماوەردا نەیان شــکاندەوە تیــۆرە کۆمەڵایەتیــەکان زیــاتر لەگــەڵ جــەماوەری

زەحمەتکێشاندا بوو، هەروەها تێگەیشتنیان لە هۆکاری کڵۆڵی جەماوەر هەبوو بۆ چەوساندنەوەیان لەوێشەوە نزیك بوونەوە لە تێگەیشتن لە هێزی بزوتنەوەی مێژوو، سوشیالیستی سەدەی هەژدەی تۆباوی (یۆتۆپیا) فەرەنسی (موریللی) لە کتێبی (سیستەمی سروشت)دا دەڵێ (زۆرینەی فەیلەسوف و سەرکردە حکومیەکان دەڕواننە دمی کۆمەڵگا لە چارەنوسی مرۆڤایەتیدا بێ‌ئەوەی هۆکاری بنەڕەتی بهێننە بەر باس کە بووە هۆی پەشێوی خەڵکان، ئەو هۆیەش خۆی لە موڵکایەتی تایبەتدا دەبینێتەوە کە وێك ناچن لەگەڵ (سروشتی) مرۆڤدا، زۆربەی سوشیالیستە یۆتۆپیەکان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد سوشیالیزم (یەکسانی) لە لایەن (بەهێزی جیهان)ەوە، لەلایەن پادشاو فەیلەسوف و دەوڵەمەندە خێرخوازەکانەوە بێتەدی ئەوانەش پێویستی‌یان بەوە هەیە کە قەناعەت پێ‌بکرێن بە دادی پرۆژەی گۆڕانی کۆمەڵگا بە سۆشیالیزم، ئەم پرۆژەیە ئامانجی دڵ خۆشکردنی مرۆڤایەتی بوو وایان دەبینی کە لەو ڕێگایەوە ئەمری بۆ خۆیان پەیدا دەکەن کە داهێنەری سیستەمی کۆمەڵایەتین، ئەو سوشیالیزمە خەیاڵیانە دەیانویست دڵخۆشی بۆ هەمووان دابین بکەن لەسەر ئەم زەوی‌یە هەروەها دروست کردنی سیستەمێکی سوشیالیستی بەڵام بێ شۆڕشی جەماوەری زەحمەتکێش، زۆربەی سوشیالیستان و یۆتۆپیانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم کۆمەڵی زەحمەتکێش و جەماوەریان تەنها بە

چەوساوەو زوڵم لێکراو دادەناو نەشیتوانی لە (مێژووی سەربەخۆ) دابینێ، سوشیالیزمە خەیاڵی‌یەکان بیروباوەڕی سوشیالیستی‌یان ئاراستەی هەموو چینەکان دەکرد نەک تەنها چینی کرێکار، بەڵام هەندێکیان وەك (سان سیمۆن) و (موریللی) بیروباوەڕیان بە پلەی یەکەم ئاڕاستەی چینی دەوڵەمەند و ڕۆشنبیران دەکرد، سان سیمۆن بۆ ئەوە بوو کە کۆمەڵگای نوێ لەسەر دینی نوێ دەکەوێتە سەرپێ کە خۆی داهێنەری بوو واتە لەسەر (مەسیحیەتی نوێ) بەوەش زاناو ئەندازیارو پیشەیی‌یەکان و واتە ڕۆشنبیرانی بۆرژواو سەرمایەدارەکانی ئەم کۆمەڵگایە دەبەن بەرێوە، ڕاستە لەنێو سۆشیال تۆباوی‌یەکاندا ڕەنگێکی تری هەبووە شۆڕشگێرو دیموکراتی کە بە (سۆشیالیزمە یۆتۆپیە ئەڵمانیەکان) ناسرابون نموونەی سەرکردەی شۆڕشگێڕی جوتیاران کە لە ئەلمانیان سەری هەڵدا لە سەدەی شانزەهەم (توماس میو نتیس) بوو هەروەها تۆباوی سەدەی نۆزدەهەم (فیتلینفت) بوو هەروەها دیموکراتی شۆڕشگێڕی ئینگلیزی (ئەونیستانلی) کە لە قۆناغی شۆڕشی بۆرژوازی ئینگلیزیدا لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەری‌هەڵدا، (سوشیالیزمە تۆباوی‌یە دیموکراتە شۆڕشگێڕە فەرەنسیەکان) وەك فیللی/ مایلی/ بابوف/ دیزامی، بلانکی/، هەروەها چەند کەسێکی دیموکراتی شۆڕشگێڕی روس وەك، بیلینسکی/ گیرتسن: ئەگاربوف/ تشیرنیشفسکی، بروليونوف/ بيساريف/ شيفنشينكو/، هەروەها دیموکراتە

شۆڕشگێڕەکانی (چین) و هندو وڵاتەیەکگرتووەکان بلگاریا/ هنگاریا، ڕۆمانیاو پولونیا، ئیتالیا/ تورکیا/...، (بابوف لەنێو سوشیالیستە تۆباویەکان لە سەدەی هەژدەدا بیری دیموکراتی شۆڕشگێڕانەو دەسەڵاتی گەل ڕاگەیاند، (بابوف) و کۆمەڵەکەی کە فێری هوشیاری دیموکراتی و شۆڕشگێڕی و سوشیالیستی بوون. دەوڵەمەند بوون بە ئەزموونی شۆڕشی بۆرژوازی فەردنسی، بابوفیەکان مەسەلەی ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی گەلیان خستە ئەستۆی نێو تیۆرو پرۆگرامی چالاکیەکانیان، (بابوف) وەك ئەوانەی پێشووی خۆی دەڵێ (خەڵکان هەموو مافی ئەوەیان هەیە کە بە خۆشی بژین، ئەمەش ستێرکی "هدف" یەکگرتنیان بوو لە کۆمەڵدا) هەروەها لەو ڕوانگەیەوە دەڵێ سەرکەوتنە ددستیەکانی چەوسێنەران بۆ نەزانینی جەماوەر دەگەڕێتەوە، (فیتلینخ) لە لایەن چەوساوەکانەوە دەڵێ (پێویستە پشت نەبەستێ بە هیچ شتێك تەنها شمشێرەکەی نەبێت) و (سەرکردەکانیان هەڵبژێرن) هەروەها هۆی پوکانەوەو فەشەلی ڕاپەڕینە گەلیەکان، بۆ بەزەیی گەل بۆ دوژمنەکانی واتە دەوڵەمەندەکان) دەگەڕێنێتەوە، هەروەك چۆن لە ڕاپەڕینی (لیون) و شۆڕشی ١٨٤٨دا ڕوی دا، (فیلینخ) بەدەر نەبوو لە بیروباوەڕی سان سیمۆن بەڵکو شوێنێکی لە مێشکیدا جێگیر کردبوو وەك ئەوەی کە ڕابەرایەتی کۆمەڵ پێویستە فەیلەسوف و زاناکان بن، ڕاپەڕینی (مەسیحیەتی نوێ) کە دێت (هەڵگری شمشێرێکە بۆ ئەوەی ئارمانجەکان

و وانـەکانی مەسـیحی یەکـەم بهێننـەدی بـەهۆی ئازایەتی‌یـــەوە دەبێتـە پێشەوای ئەرتەشی شۆڕشگێڕ بە هۆی یاریدە دەرەکیەکانیەوە. ژێرخانی سیستەمی کـۆن دەروخێنـــێ، مـارکس و ئـەنگلس لـە تێروانینـەکانی (فیتلینـخ)دا یەکـەم بزوتنـەوەی تیـۆری خـۆی پێشـکەش پرۆلیتاریـــای ئەڵمانی دەکات، وەك سەرەتای بیرێکی ڕێك کە وێنەی نەبووە لـە مێـژوی ئەڵمانیای پێشوودا،

پێش ئـەوەی بچینە سەرباسی ڕوانگەکانی دیموکراتـە شۆڕشگێڕەکانی ڕوس، دەبـــێ کـــەمێك بڕوانینـــە ڕوانگـــەکانی مێژوونوســـانی بـــۆرژوا فەرەنسـیەکان لـە قۆنـاغی گەڕانـەوەی موڵکایـەتیدا Rest auration وەك، مینی/ تیری/ گیـزو کارگیـەری کـردە سـەر شۆڕشـی بۆرژوازی ئەڵمانیا، هەروەها ململانێی چینایەتی دروست کرد، ئەو مێژوونوسانە هـەوڵیان دا مێـژووی کۆمـــەڵگا ڕاڤــە بکــەن بــە تایــەبتی ڕاڤــەکردنی بازدانـــە بلیمەتی‌یەکان بەهۆی: تێکۆشـانی چینایـەتی و تێکۆشـانی جـەماوەر، (مینی) لە کتێبەکەیدا (مێژووی شۆڕشی فەرەنسی) ئاماژەی بەوددا کە مێـژوو کتێبی ژیانی کەسانی بلیمـەت نیە، بەڵکو مێـژوی گەلانـە، دوای ئـەوە ئـەو بیرەی (تیری) درێـژەی پـێدا وەك ددڵێ (بزوتنـەوەی خـەڵك لـە ڕێگای سەربەستی و گەشەکردنەوە (زۆرتر لـە کاروانی فەتحەکان جێی بایەخی ئێمەن هەروەها ماندووبونیان ڕامان دەچڵەکێنن زۆرتر بە تـەنگ و چەڵەمەی ئەو پادشایانەی کە لە موڵکەکانیان بێبەش بوون) مینـیو

تیری و گیند هەرڵیان دا بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی گەلان و درامەتیان، هەروەها ئاماژەیان بە بایەخی پەیوەندی موڵکایەتیدا، سەرەڕای ئەوەش لە مەسەلەی تێگەیشتنی ئایدیالیستانە بۆی دەچوون، بۆ هۆکاری سەرەکی بۆ گۆڕینی کۆمەڵ وای بۆ چوون کە لە گەشەکردنی بەرهەمی مادیدا خۆی نەدەنواند بەڵکو لە پێشکەوتنی زانستەکاندا پێیان وابوو خۆی دەنواند زۆرجار دابەش کردنی کۆمەڵیان بە زەبرو زەنگ ڕاڤەکرد، وەك دەست بەسەراگرتنی نەتەوەیەك لەسەر نەتەوەیەکی تردا یان دەست بەسەرگرتنی شوێنێك و لکاندنی بە خۆیەوە، بەهۆی تەنگی چینایەتی (مینی/ تیری‌و گیندو/ هەمدیسان دەگەڕانەوە بۆ تیۆرە کۆنەکەی کە دەڵێ (مێژوو زەحمەتکێشان دروستی ناکەن، بەڵکو تەنها چینەموڵکدارەکان دروستی دەکەن، هەروەها بزوتنە جەماوەرییەکان بە ململانێیەکی ئارەزووی کوێرانە لە قەڵەم دەدەن، مێژوونوسانی ئینگلیز لە سەدەی هەژدەمدا ڕۆڵێکی گرنگیان بینی بۆ ڕۆشنایی کردنی ڕۆڵی جەماوەر لە مێژوودا، خاوەن ئایدۆلۆژە شارتیەکان جێگایەکی تایبەتیان هەبووە بە تایبەتی بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیە، بەڵام دیموکراتە شۆڕشگێڕە ڕوسەکان نزیکترین نوێنەرانی سوشیالیزمی توباوین پێش مارکسیزم بۆ مەسەلەی تەواو لە ڕۆڵی جەماوەر لە مێژوودا، ئەو دیموکراتە شۆڕشگێڕە ڕوسیانە کە مادی بوون بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی فەلسەفە بنەڕەتیەکان لە تێگەیشتنی سروشت، ئەوان کە دیالیکتیکی

)هیگڵ*یان به (جبر الثورة) (زۆرەملێی شۆڕش) دانا (گیرتسن)، به گوێ بۆ پێشەوە دەچوون له ژیانی مەتریالیزمی دیالەکتیکیدا، هەروەها (لەنین) وتی (زۆر نزیك بوونەوە لێی له بەردەم مەتریالیزمی مێژوویدا وەستان) دیموکراتە شۆڕشگێڕە ڕوسەکان/ گیرتسن/ بیلینسکی/ ئەگاربوف تشێرنیتفسکی: دبرولیوبوف/، کە دەربڕینی ڕای بەرژەوەندیەکانی جوتیارانی کۆیلەی ڕوسیا بوون، هوشیاریەکی ڕەخنەسازیان هەبوو بۆ ئەو شتانەی داخواست بوو له پێشوودا واتە له بیری کۆمەلآیەتی ڕوسی ئەورووپی خۆرئاوا، زۆر پێشکەوتن بە تایبەت ئەو بیرو باوەڕە شۆڕشگێڕیەی (رادیشیف)ی مادی ڕوسی پەرەی پێ‌ی‌دا، هەروەها تیۆری مەتریالیزمی فورباخ و دیالیکتیکی هیگڵ، هەروەها تیۆرەکانی سوشیالیستە تۆباویەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزەکان دەربارەی ڕۆڵی جەماوەر له مێژوودا، (رادیشیف) کە کتێبەکەی (گەڕان له بترسبورگەوە بۆ مۆسکۆ ساڵی ١٧٩٠) دژی دەسەلآتی ڕەهاو سیستەمی کۆیلایەتی دەداو هەروەها جوتیارانی هاندا بۆ ڕووخاندنی سیستەمی دەرەبەگ، (رادیشیف) بۆ جوتیاران دەنوسێ و پێیان دەڵێ (کەرەستەی جوتەکانیان بشکێنن، ئاگر بەربدەنە ماڵەکانیان و گونیە گەنمەکانیان، خۆڵەمێش بکەن بەسەر کێڵگەکانیاندا، لەبەرئەوەی لەوێوە ئازارەکان هاتنەدی، بە زۆر دەمیان داخەن تا هەر کەسێك بیانبینێ بێزاری دەبڕێ بەرامبەریان، بەڵکو هەتا خۆیان دووربگرن بۆ ئەوەی وەك ئەوانیان

ڵنەیەت هەروەها دەڵێ (ئاخ.. ئەو کۆیلانەی کە بە کۆت بەندکراون بەشێوەیەکی هەڵچوونی کلۆلانە هەستن بۆ ئەوەی سەرمان پان بکەنەوە بەو کۆتانەی کە ئازادیان پێکوت کراوە، سەری گەورەکانیان، ئەوانەی کە بەزەیی‌یان تێدا نیە، کێڵگەکانیان سوورکراوە بەخوێنمان! دەوڵەت چی زەرەرمەند دەکات؟ ئەوکاتە لە نێوانیاندا پیاوانی بلیمەت هەڵدەستن بۆ بەرگری کردن لە چەوساوەکان، هیچ گومان لە دەروونیاندا نیە کە ناوی گومان بێت ئێمە کە باوەڕ بە مافیان ناهێنین لە چەوساندنەوەی خەڵکانی دی ئەمەش خەون نیە، تێڕوانینم پەردەی کاتی چڕ دەبڕی کە دواڕۆژ لە چاوماندا ون دەکات، منیش وای دەبینم کە لە ماوەی سەدساڵ چی ڕوودەدات.

با بوفیەکان مێژووی کۆمەڵگا بە مێژووی ململانێی هەمیشەیی دەبینن لە نێوان هەژاران و دەوڵەمەندەکاندا، لە نێوان گەورەکان و گشتدا، ئەم ململانێیە بەردەوام دەبێ لەوکاتەوە کە مەیلی لایەک بەدیار دەکەوێ بۆ بردنە سەری ژیان لەسەر شانی ئەوی تر، لە ئەڵمانیا (فیتلینغ)ی شیوعی خەیاڵ دانی پیادانا بە پێویست بوونی شۆڕشی جەماوەر، هەروەها شۆڕشی سیاسی پێویستە بە شۆڕشی کۆمەڵایەتی پڕبکرێتەوە، گیرتسن/ بیلینسکی/ تیشر نیشفسکی/ دبرو لیوبوف/ ڕۆڵی تاکەکەسی هەڵکەوتیان نرخاند لە مێژوودا، بەپێی تێگەیشتنی خۆیان، هەروەها جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە مرۆڤ ناتوانێ بە تەنهاو بە

ئیرادەی خۆی ڕەوڕەوەی مێژوو بگۆڕێ، هێزی ئەو تاکەکەسە هەڵکە، توانە تەنها گوزارش کردنە لە پێداویستی‌یەکانی کۆمەڵگا، چونکە گەل پاڵەوانی کەمە لە ڕوداوە گۆڕانکاریە مێژوویی‌یەکاندا، (گیرتسن) دەربارەی ئەزموونی یەکەم قۆناغی شۆڕشی بۆرژوازی فەرەنسی ساڵی ١٨٤٨ دەڵێ (بێگمان شۆڕشی ٢٤ شباط پرۆژەیەك نەبوو کە پێشووتر داڕێژرابێت، بەڵکو ئیلهامێکی بلیمەتانە بوو کە لە گەل پاریسەوە دەرچوو)، سەرەڕای ئەوەی دیموکرات شۆڕشگێرە ڕوسەکان لە چوارچێوەی سوشیالیزمی تۆباویدا مانەوە لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئایدۆلۆژی شۆڕشی جوتیاران لە قەڵەم دران، هیواکانیان خستە سەرشۆڕشی گەل نەك ڕیفۆرمیستە کۆنەکان، (دبرولیوبوف) دەڵێ (مێژوو سەربوردەی پیاوانی بلیمەت نیە) مێژوو بایەخ بە کەسانێك نادات تەنانەت بلیمەتەکانیش، لەبەرئەوەی بایەخێکی تایبەتیان هەیە لای گەل، لای مرۆڤایەتی، مێژوو مێژووی دەوڵەت نیە، وا پێویست دەکات کە بابەتی سەرەکی مێژوو ژیانی گەل بێت، کاتی ڕۆڵی تاکەکەس ڕوون دەکەینەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە (چۆن توخمە زیندووە پێشکەوتووەکان خۆی نواند کە توانی لەگەلەکەیدا ئاشکرای بکات، مێژووی گەلان بە شێوەیەکی یاسایی دەڕوات بەڕێوە، مل کەچ ناکات بۆ ئارەزووەکانی خەڵك، تەنانەت ئەو گۆڕانکاریانەی لە سەرەتاشدا دەست پێدەکەن و بە ئاکامن و خراپ نابێت گەر دژی کاروانی سروشتی مێژوو

نەبێت و دژی سروشتی بەرژەوەندی گەل نەبێت، (بیساریف) بیری تیۆری لەسەر ڕۆڵی جەماوەر لە مێژوودا پەرەپێدا، وا بۆی دەچێ کە لێکۆڵینەوەکانی پێشوو بۆ مێژوو زانستی نەبوو لەبەرئەوەی مێژوونوسان لە ژیانی گەلان نەکۆڵیونەتەوە، تەنها بە لێکۆڵینەوەی مێژووی دەوڵەتەکان/ پادشاکان/ داگیرکەران/ نەبێت، مەسەلەی ڕەوشی جەماوەر یەکێکە لە مەسەلە سەرەکیەکان لە مێژوودا، لێکۆڵینەوەی مێژوو بەوەش بایەخی پێدراوە کە ڕێگا دەکاتەوە بۆ تێگەیشتن (چۆن جەماوەر هەست دەکات و بیردەکاتەوە؟ و چۆن دەگۆڕێ؟) ئەو بارودۆخانەش چی‌یە کە بووەتە هۆی گۆڕینی هێزی ئابووری و هزری، ئەو شێوانە چین کە دەبنە هۆی گۆڕینی هەڵس و کەوتیان، ئەو سنوورە چەندە کە سەبری گەل دەوەستێ لە بەرمیدا؟ لەسەر مێژوو ئەوەیە کە چیرۆکی ژیانی جەماودر بە ڕاستی‌و عەقلانی بنوسێتەوە هەروەها ڕووداوە کەسایتی‌یەکان کە شوێن لە مێژوودا دەگرن و کاریگەریان هەبووە بۆ سەر جەماودر لەگەڵ ڕاڤەکردنی ئەو ژیانەن ئەو مێژووەیە مروڤ بیرمەند ڕادکێشێ (بیساریف) دەڵێ (جەماوەر بێبەش لە خوێندن و فێربوون یا ئەوەتا ملی پێ کەچ دەکرێ یان بەشداری لە بزوتنەوەکاندا دەکات بەشداریەکی ئەندامێتی، بەبێ هۆش هەر بۆیە تا ئێستا هێزی زیندو لە گەلاندا ڕۆڵی خۆی نەدیوە لە ڕووداوە مێژوویی‌یەکاندا تەنها ڕۆڵی ثانوی نەبێت چوارچێوە ڕامیاریەکان گۆڕان

و دوڵەتەکان دروست بوون هەندێ دەوڵەت ڕوخاو بەڵام هەموو ئەمانە دەستیان بۆ گەل نەبرد، بێئەوەی پەیوەندی لە نێوان کەسەکاندا بگۆڕدرێ یان دابڕمێ بێجگە لەوەش پەیوەندیە چینایەتیەکان و پەیوەندیە ئابووریەکان دەستیان لێوە نەدرا) بەو شێوەیە کار وا ڕۆیشت تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لەگەڵ پێشکەوتنی هوشیاری جەماوەر ڕۆڵی خۆی بینی لە ڕووداوە مێژوویی‌یەکاندا، ئەمەش (بیساریف)ی گەیاندە ئەو بۆچوونە کە بڵێ (دیموکرات شۆڕشگێڕە ڕوسەکان نزیک بوونەوە لە ڕوانگەی مێژووەوە لە ڕۆژمێری ڕۆڵی جەماوەر لە مێژوودا، (بیلینسکی بۆ بەهێزکردنی ڕۆڵی جەماوەر لە ڕووادوەکانی شۆڕشی ١٨٣٠ی فەرەنسادا دەڵێ (گەل منداڵێکە، بەڵام منداڵێکەو گەشە دەکات، پەیمانی داوە خۆی بکاتە پیاوێك کە بە هێزو بە گورەوە دەڕژێ.. تا ئێستاش لاوازە بەڵام ڕوباری ژیانی نیشتمانپەروەری لە خۆیدا هەڵگرتووە، وەرگرتنی باوەڕ وە کوژانەوەی بینین لە دەستەدا (کۆمەڵگای خوێندەوار) مەبەستی بلینسکی لە کۆمەڵگای خوێندەواری بۆرژوازی‌یە کە گەیشتە دەسەڵات لە فەرەنسادا دوایی گۆڕدرا لە چینی شۆڕشگێڕانەوە بۆ ژینی دژی شۆڕش، (تشیر نشیفسکی) دیموکرات خوازی شۆڕشگێڕی ڕوسی زۆر چاك تێگەیشت لەوانەی تر لە لایەن تێگەیشتنی زانستیانە بۆ ڕۆڵی جەماوەر لە مێژوودا هەروەها ڕۆڵی چینە پێشکەوتووەکان/ شۆڕشگێڕەکان لە پێشکەوتنی کۆمەڵی

سیاسی‌دا لەنێن لە خۆیەوە نەیوتووە (نوسینەکانی "تشێر نشیفسکی" بۆنی شۆڕشی چینایەتی لێ دێت)، (تشێرنشیفسکی لەوە زیاتر ڕۆیشت و پێی داگرت کە جەماوەری زەحمەتکێش هێزی بزوتنەوەیە لە پێشکەوتنی مێژوودا)، ڕەوشی مێژووی ڕوسیا کە تیایدا ئەژیا لە دواکەوتویی ئابوری و نەبونی بزوتنەوەی کرێکاری لەوکاتەدا دیموکراتە شۆڕشگێڕە ڕوسەکان نەیانتوانی لە چوارچێوەی سوشیالستی تۆباویدا و تێگەیشتنی ئایدیالیستانە بۆ مێژوو دەربچن، نەیانتوانی یاساکانی گۆڕینی کۆمەڵگا بدۆزنەوە، هەروەها نەشیان توانی لە دیموکراتیەتی شۆڕشگێڕیدا بچن بەرەو کۆمۆنیستی زانستی، ئەنگلس دەڵێ (هەموو مادیەکانی پێش مارکسیزم خیانەتیان کرد لە مادیەتدا لە تێگەیشتنی مێژووی کۆمەڵگا) مارکس و ئەنگلس یاساکانی گۆڕانی کۆمەڵگایان دۆزیەوە مارکس لە کتێبی (بەشداری کردن لە ڕەخنی ئابوری و سیاسی‌دا) دەڵێ (لە بەرهەم هێنانی هەرەوەزی ژیانی خەڵکدا ئەوانە دەچنە نێو پەیوەندیەکی دیاریکراوی پێویست سەربەخۆ لە خواستیان، لە پەیوەندیە بەرهەمیەکاندا پێک دێن بۆ پێشکەوتنی هێزی بەرهەمی مادیان، ئەو کۆمەڵە پەیوەندیە بەرهەمانەش ژێرخانی ئابووری کۆمەڵگا پێک دەهێنن، بنەمایەکی سەرەکی دروست کە سەرخانی ماف و سیاسی لەسەر دابین دەکرێ، کە هەندێک لە هۆشی کۆمەلایەتی لەگەڵ خۆیدا پێک دەهێنێ، شێوازی بەرهەمی ژیانی مادی پێویست بەکارەکانی ژیانی

گشتی دەکات، وەك كۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆحی، هوشیاری خەڵك بوونیان دیاری ناکات بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونی کۆمەڵایەتیان هوشیاریان دیاری دەکات)، پێشکەوتنی هەر كۆمەڵێك بە پێشکەوتنی هێزی بەرهەم دەست پێدەکات پێش هەموو شتێك بە گۆڕینی کەرەستەکانی کار، لەگەڵ باشکردنی ئەو کەرەستانەدا خەڵکان خۆیان پێش دەخەن، شێوازی هەڵس و کەوتیشیان دەگۆڕێ بۆ کارکردن، دیاریشە کەرەستەکان بەرهەم خەڵك خۆی دروستی دەکات و خۆشی پێشی دەخات، مارکسیەکان وای بۆ دەچن و واش لێکی دەدەنەوە کە جەماوەری زەحمەتکێش هێزی سەرەکی بەرهەم هێنانە لە کۆمەڵگادا ئەویش دروست کەری هەموو هێزە مادیەکانە کە بزوێنەری .بەکەمە بۆ کاری بەرهەم دوایش بۆ مێژووی کۆمەڵگا، پێشکەوتنی هێزی بەرهەم مەرجێکە بۆ سازدانی پەیوەندیەکانی بەرهەم، پەیوەندیە بەرهەمە نوێکان یاریدەی پێشکەوتنی هێزی بەرهەم هێنان دەدەن، بەو شێوەیە پەیوەندی بەرهەمە کۆنەکان دەبنە لەمپەرێك لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەم هۆیەش دەبێتە هەڵگیرساندنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، پاڵپشت بە هێزی کۆمەڵ. پێشکەوتوو، زەحمەتکێشان بۆ ڕماندنی پەیوەندیە بەرهەم هێزە کۆنەکان، بە کردنەوەی ڕێگا بۆ پێشکەوتنی پەیوەندیە بەرهەمە نوێکان، ئەمەش ئاسۆیەك دەبێ بۆ پێشکەوتنی تری بەرهەم، گەشەکردنی شێوازی خەڵکان و چالاکیان، لەگەڵ گۆڕینی بنەڕەتی

کۆمەڵایەتی ئابووری بادانەوەیەکی خێرا دروست دەبێ لە سەرخانی کۆمەڵایەتیدا، بەهۆی گۆڕینی ژیانی خەڵکان بە تایبەتی کۆمەڵایەتی هەروەها هوشیاری کۆمەڵایەتیشیان دەگۆڕدرێ. ئەوەی سەرەوە دیالیکتیکی گۆڕانی کۆمەڵە کە مارکس دۆزیەوە، (لەنین) بۆ ئەو بادانەوەیە کە مارکس و ئەنگلس پێی هەستان لە تێگەیشتنی مێژوو، یان بەشێوەیەکی وردبینتر، پابەند بوون بە پراکتیك و خۆبەستنەوە بە مادیەت لە بواری دیاردە کۆمەڵایەتیەکاندا، دوو نموونەی سەرەکی لە تیۆری مێژووی پێش خۆیدا بەجێهێشت.

یەکەمیان/ ئەو تیۆرانەی پێشوو لە باشترین حاڵەتدا تەنها سەیری پاڵنەرە فکریەکانی دەکرد بۆ پێشەوەچوونی گرج و گۆڵی خەڵکان بۆ مێژوو، بێئەوەی بگەڕێن بۆ هۆکارەکانی ئەو پاڵنەرانە، پێویستە یاساکانی بابەتی گۆڕینی سیستەمی پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەست پێ بکەین، بێئەوەی سەیری ڕیشەی ئەو پەیوەندیانە لە ئاستی گۆڕینی بەرهەمی مادیانەدا بکەین.

دووەمیان/ ئەو تیۆرانە بایەخیان بە گرنگی کاریگەری جەماوەر نەدەکرد، لە کاتێکدا مادیەتی مێژوویی یەکەم شت بوو کە ڕێی دا بە لێکۆڵینەوەی مەرجە کۆمەڵایەتیەکان بۆ بژێوی جەماوەرو گۆڕینی ئەم ڕەوشە بە شێوەیەکی وردبینی مێژوویی سروشتیانە، سۆسۆلۆژیای پێش مارکسیزم وا سەیری کۆمەڵ دەکات کە شتێکی چەق بەستوو

نەگۆڕە یەکەم جار هاتە ئاراوە تا هەتا هەتایی، یان تەنها چەند کەسانێك بن وەك کۆمەڵێکی میکانیکی لە تاکەکان و دەگۆڕدرێن بەهۆی مەیلی هەندێ تاك لە پادشاو داگیرکەران و زانایان.. مارکسیزم بەربەستێکی دانا بۆ ئەو تیۆرە نازانستیانە، کە ئاماژەیان بە کۆمەڵ دەکرد کە وەك سروشت وایە کە هەمیشە لە گۆڕاندایە و گۆڕانی کۆمەڵگا پێویستە وا تێی بڕوانری کە کارێکی مێژوویی سروشتیانەیە، واتە یاسایی‌یانە، مارکسیزم کۆمەڵگا لە هەموو ڕوویەکەوە لێی دەکۆڵێتەوە لە ڕووی ئاڵۆزی و دژە ناوەکی‌یەکانی‌یەوە وەك کارێکی پێشکەوتوو تێی دەڕوانن واتە گەیشتن لە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ئابووری بۆ شێوەیەکی دی لە ڕێی شۆڕشەوە دەبێ واتە لە ڕێی ململانێی چینایەتی‌یەوە دەبێت، ئاکامی ئەو بادانەوەیەی کە مارکس و ئەنگلس دیتیانەوە لە تێگەیشتنی مێژو وای لێهات بووە بنەمای گۆڕینی کۆمەڵ وەك مێژووی کارو کۆمەلایەتی خەڵك سەیر دەکرا، مارکس و ئەنگلس لە ڕێی تێگەیشتنی نوێی مێژوودوە ڕەخنەیان گرتە هەموو تیۆرەکانی سۆسیۆلۆژی ئایدیالیستی نازانستی ڕەخنەیەکی قوڵ پێش هەموو شتێك ڕەخنەیان گرتە فەلسەفەی مێژوویی کە هیگڵ (هیگڵە چەپڕەوەکان) پێی هەستان، مارکس و ئەنگلس دەڵێن (تێگەیشتنی هیگڵ بۆ مێژوو پێویست بوونە بە ڕۆحی ڕەها کە پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ واتە مرۆڤایەتی هیچ نانوێنێ تەنها ئەوە نەبێت کە جەماوەرێکە

هەڵگری ئەو ڕۆحەیە کە بەبێ هوشیاری یان هوشیاریەوە هەڵ دەگرێ)،
هیگڵ وەك مادەیەکی سلبی بۆ داهێنانی ڕۆحی ڕەها کە خۆی دەنوێنێ
لەژێر شێوەی ڕۆحی جیهانی و ڕۆحی نەتەوەیی‌دا، ئەو تیۆرە
ئایدیالیستەی کە هیگڵ پێی هەستا لێڵیەك بوو لە فەلسەفەکانی خاوەن
هەڵگرانی بیری هیگڵ واتە لەلای چەپەکانیان و ڕاست ڕەوەکانیان، هیگڵە
چەپڕەوەکان وەك (برونو بادیر) و زەحمەتکێشان وەك مادەیەکی
بەستەڵەك دەبینن واتە (دوژمنی ڕۆح) و پێشکەوتن بە شێوەی گەمژە
سەیری جەماوەریان دەکرد، مارکس دەربارەی تیۆری هیگڵە
چەپڕەوەکان دەڵێ (ئەو پەیوەندی‌یە کە (برونو) دۆزی‌یەوە لە نێوان
(ڕۆح) و (جەماوەر) کارێکی کردەیی نیەو بێکۆتایی‌یە هەروەها
سڕینەوەی نیە ڕەخنەگرانەیە بۆ چەمکی هێگڵیانە بۆ مێژوو، ئەم چەمکە
تەنها گوزارش کردنێکی زۆر سۆزداریە لە باوەڕی ئەڵمانی مەسیحیەتدا،
لەمەڕ دژایەتی (ڕۆح) و (مادە)، (خوداوەندو جیهان) ئەم دژایەتیەش وەك
ئەوەی کە لە مێژوودا (هەندێ خەڵکانی هەڵبژێردراو لەژێر شێوەی ڕۆح
(کاریگەر) بەرامبەر بە مانەوەی مرۆڤایەتی وەك ئەوەی خەڵکان ڕۆحانی
نەبن وەك ئەوەی (مادە) بن مارکس ئەم دروستکراوە (فەلسەفە
مێژوو)یی‌یەی چاند.

هەروەها (لەنین) دەربارەی فەزڵی مارکس بۆ مەسەلەی دروست بوونی
(مێژوو)دا دەڵێ (خەڵکان خۆیان مێژوویان دروست دەکەن) مەتریالیزمی

مێژوویی ڕۆڵی هرزو زانست و تەکنەلۆجیاو داهێنەران و زاناو پیاوانی دەوڵەت ڕەت ناکاتەوە لە پێشکەوتنی کۆمەڵدا بەڵام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هێزێکی دیاری کراو نین یان هێزێکی یەکلاکەرەوە نین بۆ ئەو پێشکەوتنە.

## ڕۆشنگەران و مێژوو:

کۆمەڵناسانی پێش مارکسیەکان ڕۆڵی جەماوەریان لە دروست کردنی مێژوودا وەلا نابوو بەڵکو ڕۆڵی تاکەکەسیان دەخستە پێش ڕۆڵی کۆمەڵو تاکەکەسیان بە دروست کەری مێژوو دادەنا، وەك پاڵەوانان پادشاو سەربازەکان و زاناو فەیلەسوف و داهێنەرەکان، ڕەگی ئەو بۆچوونەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی ئایدیالیستی بۆ مێژوو کە بیری دەکردە هێزێکی دوا بزوێنەر لە مێژووی کۆمەڵگادا، ڕۆڵی مادیەت و پێشکەوتنی شێوازی بەرهەم شێوازی ژیانی خەڵکیان وەلانابوو، ئەم بۆچوونەش لەلایەن خاوەن کۆیلەو دەرەبەگەکانەوە سەری هەڵدا،

پیاوانی بیرمەند کە نوێنەرانی چینی سەرەوە بوون کە دەیانڕاوانی تیۆرەکانیان دەبنە هۆی چڕی حەتمی بۆ کۆمەل دوا بزوێنەر بۆ مێژوو واشیان دادەنا کە هزر خەڵك بەرێوە دەبات، (ئەفلاتون) و پیاوانی لاهوتی سەدەی ناوەنجی (توما ئەکوینی) و (یوسوبی) و (بریکلی) و (جوزیف) و (دومیستر) و (هیگڵە نوێکان) و (کانتە نوێکان) و (براگماویەکان) ئەوانە هەموو وا سەیری جەماوەریان دەکرد کە دژی ڕۆح و هزرو مەدەنیەت و ڕۆشنبیرین و ناتوانن ڕۆڵی سەربەخۆیانە ببینن لە مێژوودا، بیرمەندە لاهوتیەکان (ئۆگستین) و (تۆما ئەکوینی) (یوسوبی قەس) مێژوویان وەك ڕاستیەك (ئیرادەی خودا)یی سەیر دەکرد، گەلان و کردەوەو تێکۆشانیان وەك کەرەستەیەك بۆ (ئیرادەی خودا)یی دەڕوانی، بەڵام نازارو ئەشکەنجەی جەماوەر لە بارودۆخی جێبەجێ کردنی دروست کردنی کۆمەڵایەتیدا بەکاری شەیتان ڕاڤە دەکرد کە گەلانیان لە ڕێی ڕاستی خودایی لادەبرد، لەسەر بنگەی ئەوەی کە سزای خودایەو بە مرۆڤی دەگەیەنێت بۆ ئەو تاوانانەی کردوویانە، لەنێو ئەو ئایدیالیستانەدا بیرمەندی وەکو (ڤیکۆ، ڕۆسۆ) هەبوو کە پەیوەند بەتینیان هەبوو لەگەڵ جەماوەردا وە ئاماژەی ڕۆڵی جەماوەریاندا بۆ پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتی (ڤیکۆ) نەك ڕۆڵی جەماوەری نیشان دا لە پێشکەوتنی دەوڵەتدا بەڵکو لە پێشکەوتنی ڕۆحی و داستانە شیعریەکانیشدا ئاماژەی پێکردن (ڕۆسۆ) لە شۆڕشی فەرەنسادا

(١٧٨٩) ژینا بالادەستی هێزی گەلی پێش خست لەنێو فەرەنسادا وە مافی بە جەماوەردا بۆ گۆڕینی ڕژێمی كۆمەلایەتی و سیاسی و ڕاپەڕاندنەكان دژی چەوسێنەران، ڕۆشنگەرانی فەرەنسی سەدەی هەژدەهەم بە تایبەتی كە پێك هاتبوون لە ئایدۆلۆژی بۆرژوازی بە توندی ڕەخنەیان لە سیستەمی دەرەبەگی دەگرت و لە كارو كردەوەكانی پادشا دەرەبەگەكان و دروشمی سەربەستی و یەكسانی و برایەتیان هەلكرد، سەرەڕای ئەوەش جەماوەریان بە دروست كەری مێژوو نەدەزانی وەك بابەتێك بۆ مێژوو دەیانڕوانیە جەماوەر، مێژووی مرۆڤایەتی لە ڕوانگەی ڕۆشنگەرانی سەدەی هەژدە هەروەك (دیدرو) دەلێ (مێژووی چەوساندنەوە بوو، كۆمەلێك لە فێلبازو ساختەچی پێی هەلدەسن)، ڕۆشنگەران هۆكار كۆیلەیەتی و چەوساندنەوەیان نەدەزانی لە مەرجە ئابوریەكاندا بۆ پێشكەوتنی كۆمەل بەلكو هۆكاری كۆیلایەتی و چەوساندنەوەیان دەگەڕانەوە بۆ نەزانینی جەماوەر یان بۆ تێنەگەیشتنی جەماوەر، هەروەك (هیلفیتس) دەلێ (چەوساندنەوە ئەو كارەساتە مرۆڤایەتیە قورسەیە، پێش هەموو شتێك ئاكامی نەزانینی جەماوەرە، هەموو جەماوەرێك سەربەستە لە (البداءة) بەلام چۆن ئەو سەربەستیە ڕاڤە بكەین، ئەو ڕاڤەكردنەش خۆی لە نەزانینی جەماوەرەوە دەبینێ، ئەویش باوەڕ پێكردنە گەمژەكەیەتی بە چاوچنۆكان) بە ڕای ڕۆشنگەران پێویستە خەلكان فێركرێن بۆ ئەوەی سەربەستی بالادەست

بێت هــ ڕوەها یەکســانی و برایــەتی، فــێرکردنی خــەڵکان لــە ڕێی ڕۆشنبیراز و ڕۆشنگەرانەوە دەبێت، ڕوانینی بۆرژواکان کە ڕۆشنگەرانی فەرەنسی ـەرقاڵ کردبوو ئەویش جەماوەری (نەزان) ناتوانێت مێژووی خۆی درو.ـت بکات، (بۆیە هـزر جیهان بەڕێوە ددبات) وەك ڕۆشنگەران دەڵێن لێرەشەوە بەرهەمێکی لۆژیکی لەدایك بوو ئەویش (دروست کەری مێژوو ئە‌و ڕۆشنبیرانە یان ئەو ڕۆشنگەرانەن کە بێ لایــەنی لــە لایــەن گەلەوە نابینن (بەشێوەی کۆمەڵ)، ڕۆشنگەرانی بۆرژوا ڕوانگەی خۆیان دژی سیستەمی دەرەبەگ و دەوڵـەتی دەرەبەگ بوو هەروەها ئاراستەی دینیشــیان دەکــردو بــە تایبــەتی کڵێســــە بۆیــەش ڕووکـــارێکی پێشکەوتنخوازانەیان وەرگرت.

# ڕاڤەکردنی جوگرافیایی بۆ مێژوو:

هۆکارە جوگرافیاکان وەك باران کەش و ڕووبارو خاك و سامانی کانزایی یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی گۆڕانی ڕەوتی مێژووی بەشەری و گواستنەوەی شارستانێتی مرۆڤایەتی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی، ئەو هۆکارەو گشتیەکانیان مرۆڤ ئامادە دەکات بۆ بەرگرییە گشتی‌یەکان کە وای لێدەکات زاڵیان کات بەسەر سروشت و کۆمەڵگادا، دوایش هەر ئەوە کە چارەنوسی ئەوەی دەداتێ کە لە توانایدا بێت و بتوانێت بەسەر ئاستەمە سروشتی و کۆمەلآیەتیەکاندا کە بەربەست دەبن لەبەردەمیاندا زاڵ بێت بە سەریاندا، ڕەگی ئەو بۆچوونانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زانا یۆنانیانەو فەیلەسوفە یۆنانیانە لە پێش هەموویانەوە (ئەبوقراط) و (ئەرستۆ)، (ئەبوقراط) کە ناسرابوو بە (باوکی پزیشکی) لە کتێبەکەیدا بەناوی (کاریگەری هەواو ئاوو شوێن لەسەر جەستە) هەروەها (ئەرەستۆ)ش لە کتێبەکەیدا کە بەناوی (سیاسەت)ەوە

دای ئـاوه کـه پێشـکەوتنی یونـان لـه بـیرو سیاسـەتدا دەیگەڕانـەوە بـۆ هۆکاری دەوروبەر کە شوێنی وڵاتەکەی تێکەوتبوو لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا (ئاسیاو ئەوروپا) چونکە کەشـی وڵاتەکـەی لـەبار بـوو لەبـەر ئەوەش ڕۆمانیەکان لە سەردەمی‌دا گوێزرانەوەو بووە هۆکاری جوگرافی (ابن خلـدون)یـش یـەکێك بـوو لـه زانـا عەرەبـەکانی سـەردەمی خـۆی بـۆ ڕاڤەکردنی هۆکاری جوگرافی بۆ مێژوو، هەر بۆیە زەوی دابەش کرد بۆ حەوت ناوچەی جوگرافی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەمەشی بۆ ئـەوە کرد کە پێشکەوتنێ ببینێ لە شارسـتانیەتی عـەرەبداو هۆکەیشـی بـۆ شوێنی جوگرافی ناوچەی عەرەب دەگەڕانەوە کە لـه جێگایـەکی لەباردا دەژیان، بیری جوگرافی کاریگەری کردە سەر (ابن خلدون) بیری (سترابو ٢٤ ب.م) کاریگەری کردبووە سـەر (ئەرەستۆ)، (سترابو) زەوی بۆ پێنـج ناوچە دابەش کرد، یەکەم گەرمەو بۆ کارکردنی هەمیشەیی دەست نادات لەبە ئـەوەی زۆر گەرمـە، دوانیشـیان ساردن و بـۆ کـارکردنی هەمیشـەیی دەسـت نـادات لەبەرئـەوە زۆر سـاردە، دوانیشـیان لـەبارن بـۆ پێشـکەوتن باشن و دەتوانرێ بە ئاسوودەیی ژیانی تیا بەرقەرار بێت، (مونتسکیو) دیاردەی (تـاوان)ی بە ڕاڤەیکی جوگرافیایی ڕاڤە کرد وای دەبینـی کـە تاوان لە ناوچە گەرمەکاندا زیـاتر ڕوودەدەن وەك لـه ناوچـه ساردەکاندا، واتـه ئـەو ناوچەیەی کە لە هێڵی (الاستواء) نزیکە زیاتر تـاوانی تیـادا سـەرهەڵدەدات (مونسـتکیو) لــەوە زیــاتر دەڕوات بــۆ ڕاڤەکردنەکــەی

کاریگەری ی هەوا لە شارستانیەت و کۆمەڵ و مرۆڤدا، جیاوازیەکانی نێوان نەتەوەکان لە سیستەمی سیاسی و ئاکاریاندا (مونتسکیو) وای بۆ دەچێ کە هۆکارەکەی بۆ کەش و جگرافیاکەی دەگەڕێنێنەوە گەندەڵی سیاسی زۆر دەبێ کە زیاتر لە هێڵی (الاستواء)ە وە نزیك دەبینەوە، لای ئەو ناوچەی گەرم و یاسا ئاکاریان و سەربەستی بە سیاسیەکان بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن لە ناوچە گەرمەکاندا (مونتسکیو) یاسا ئاکارە بڵاوەکانی لە کۆمەڵی فەرەنسی لەزەمانی خۆیدا بە بنچینە دادەنا بۆ بڕیاردان بەسەر کاری تاك و کۆمەڵگادا، وای دادەنا کە خۆدوورخستنەوە لەو یاسایانە دوورکەوتنەوەیە لە ئاکاری خۆی، ڕاستیش جیاوازی لە نێوان نەتەوەکاندا لە باری دروست بوونەوە ئەوە جیاوازیە لە نێوان سیسەمی دروست بوون و یاسا کۆمەلایەتیەکاندا، هەندێ پسپۆڕانی هاوچەرخی تاوان تیۆرەکەی مونتسکیو وەك بنچینە بە ڕاست دەزانن، مامۆستا (ئەدون بکنن) زیاتر تیۆرەکەی (مونتسکیو)ی بەڕاست ئامارە پێکردوو ئەویش بەهۆی لێکۆلینەوە ئاماریەکانیەوە کە لە ئەڵمانیاو فەرەنساو ئیتالیا پێی هەستا، بنەمای ڕاڤەکردنی جوگرافی بۆ مێژوو لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ئەڵمانیا زیاتر جەختی لەسەر کرایەوە بە درێژایی دەسەلاتی نازیەت ڕێبازی جوگرافی سەری هەڵدا بەناوی "Geopolitics" و "Geopolitics) واتا جوگرافی سیاسی بۆ یەکەم جار لە جەنگی جیهانی

یەکەمدا بڵاوبووەوەو کاری پێکرا دوای ئەوەش لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان کاری پێکرا لە نێوان هەردوو جەنگدا ئارمانجی سەرەکیش هێنانەدی خزمەتی حکومەت بوو لە مەیدانی سیاسەتدا لە مەلەسەی جوگرافیادا، زانای سیاسەتمەداری سویدی (Radolf Kjelen) ئەندامی پەرلەمانی سویدی یەکەم کەس بوو کە ئەو مەسەلەیەی ووروژاند بە کاریگەریتی زانای جوگرافی ناسی ئەڵمانی فریدریك راتزل (Ratzel ١٨٤٤- ١٩٠٤) کە وای دەبینی دەوڵەت وەك مروڤ وایە لە لایەن پێکهاتەو چالاکی‌یە وەزیفەکانیدا وەك ئەو کەسانە وایە کە دەوڵەتیان لێ پێك دێت لە لایەن پەیوەندیەکانیان بەیەکەوە لەگەڵ دەوڵەتدا وەك ئەندامی جەستەی مروڤ وان کە هەر ئەندامێك کارێکی تایبەتی خۆی هەیەو هەر هەمووشیان هاوکاری دەکەن و لە خزمەتی جەستەدان، هەندێکیان وەزیفەی هەندێکیانی تر دەبینن ئەگەر بەرژەوەندی جەستەی تێدا بێت، کوێر بە دەستی دەبینێ کەڕیش بە چاوی دەبیستێ، دەوڵەت بە ڕای راتزل (Ratzel) لە بوون و بایەخداندا پێش تاکەکانی کۆمەڵی خستووەو بەڕاقی ترین دەزگای کۆمەڵایەتی سەیری دەکات کە کۆمەڵ و خێزانیش دەگرێتەخۆ گەر وا بێت کەواتە دەوڵەت ئارمانجەو خەڵکان بوونە کەرەستەو لە خزمەتیدان، پێویستە لەسەر کۆمەڵ کە مل کەچی داخوازیەکانی دەوڵەت بن گەر لەگەڵ هەندێ بەرژەوەندیەکانیشیانا نەگونجێ و پێویستە قوربانی بدەن لە پێناویدا هەرکات پێویست بکات،

کاتێك بەرژەوەندی لەش پێویستی کرد کەوا تێ.ا. هەڵکەندریٚ دەبێ هەڵکەندریٚ واش کە بەرژەوەندی دەوڵەت هەروەك چۆن سەرکردە دەیبینێ بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت زۆرجار لە ناوەوە جەنگ دەست پێ دەکات و کەسان قڕدەکرێن دەبێ لەسەر هەموو داخوازی سەرکردە جێبەجێ بکەن، دەوڵەت و لەشی مرۆڤ لێك دەچن لەبەر ئەوەی هەندێك ئەندامی لەش لە هەندێکی دیکەیان باشترن لە کارەکانیاندا، هەروەها ئەندامی کۆمەڵیش هەندێکیان باشترن لە هەندێکی دیکەیان لە باری کارو فەرمان و بایەخیانەوە ئاوەهاش لە خوارەوە تا سەرەوە واتە تا سەرکردە، بەڵام پەیوەندی دەوڵەتان بە یەکەوە وەك هەمان شێوە وایە دەوڵەت هەیە لە دەوڵەتی دی پلەیەك باشترە لە ڕووی سەرکردەوەو بایەخیەوە، هیگڵ دەوڵەتی بروسی بە مەزنترین دەوڵەتی دادەنا لە ڕووی شوێنەکەیەوە، شارێتی دەوڵەت بەجێگاکەی پێوانە دەکرێت لە پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا وەك ئەو پەیوەندیەی لە نێوان کەسەکانیدا هەیەو هەروەها پەیوەندیان بە دەوڵەتەوە، تەنانەت لە دەوڵەتە دواکەوتوەکانیشدا خەڵکان نابێ دژی دەوڵەتی خۆیان شۆڕش بەرپابکەن بۆ گۆڕینی قەوارەکەی لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتانە (بە نیسبەت دەوڵەتانی ترەوە شارێن) لەگەڵ ئەوەشدا لە تاکەکانی خەڵك ڕاقی ترد، هەروەها گرژی تاکەکەس لەنێو هەر دەوڵەتێکدا بە پێکەوە هەڵکردنیان سەیر دەکرێت لەگەڵ یەکتریدا واتە تاکەکەس لەگەڵ دەوڵەتدا، سیاسەتمەداری

سویدی (RadolfKjelen) دەوڵەتی وەك لەشی مرۆڤ سەیر دەكرد لەدایك بوونیەوە تا پێشكەوتنی و تا نەمانی، هەندێك لە كتێبەكانی گۆڕدران بۆ زمانی ئەڵمانی لە دوا ساڵەكانی جەنگی جیهانی یەكەم، سەرهەنگی ئەڵمانی خانەنشین (كارل) لە ساڵی ۱۹۱۹ پەرەی بەو مەسەلەیە داو لێی كۆڵیەوە كە ناوبراو هەمیشە لەگەڵ هیتلردا پەیوەندی بەتینی هەبوو لە ساڵی ۱۹۲۳ و ۱۹۲٤ كاتێك هیتلر بەند بوو لە میونخ لێكۆڵەرەوان دەڵێن كاریگەری كرد بۆ سەر بیروڕاكانی هیتلر ئەویش لە كتێبی (تێكۆشانم)ی هیتلر بەدی دەكرا، مەسەلەی (Geopolitics) گرنگی پێدرا لە ئەڵمانیادا كە هەندێ لقی تری لێ بۆوە، وەك "Geostatigy و Geo- economic و Geo- medicine" یەكەم بەشیان بایەخ دەدات بە مەسەلەی كاریگەری دەوروبەری سروشتی (هۆكار جوگرافی) لەسەر تاك و كۆمەڵ بایەخێكی زۆری پێدرا لەلایەن لێكۆڵەرەوە پیشەواكانی لێكۆڵینە زانستەكان ئەو بایەخەی ئاشكرا كرد بۆ دروست بوونی دوولایەنی فەلسەفی و بایەلۆژی بۆ تاكەكانی كۆمەڵ هەروەها لە لایەنی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتیشەوە كاریگەری خۆی كرد، كاریگەری دەوروبەری جوگرافی دەركەوت بۆ مرۆڤ لە لایەنی لەش (وەك بیرو دروست بوون و مەزاج)، جیاوازی لە نێوان پێستی زنجیەكانی ئەفریقیاو خەڵكی ئەڵمانیا (كە هتلر بە گەلێكی شازی دادەنان) زانستیانە ئیسپات كرا كە جیاوازی ڕەنگی پێستی ئەڵمانی ڕەنگی پیستی زنجیەكان بنەماكەی دەگەڕێتەوە

بۆ هۆکاری جوگرافی و کەش هەروەها لەسەر لەشی مرۆڤ، هەندێ لە لێکۆڵەرەوان وای بۆ دەچن کە هەندێ بیروڕای ئاینی و سیاسی‌و ئاکاری دەگەڕێتەوە بۆ جۆری دەوروبەری جوگرافیان، دەوروبەری سارد کە ئەسکیمۆکان تیایدا دەژین، ئەو جێگا ساردیە وای لێکردن، کە بۆچونیان بۆ بیری بەهەشت لایان لە لایەنی دینیەوە هیچ جیاوازیەکی نیە لە دۆزەخ لە دینی ئیسلامیدا هەندێ جار کەش کاریگەری ڕاستەوخۆ دەکات لەسەر هەڵس و کەوتی مرۆڤ بێ‌ئەوەی گۆڕانکاری لە پێکهاتەی لەشی مرۆڤدا دروست ببێت، لێکۆڵینەوە بۆ ڕاڤەکردنی مێژوو لە ڕووگای جوگرافیاوە ئەم سێ ڕایەی خوارەوە دەدات بە دەستەوە:

١-ڕای مامۆستا Metinko FF کە مێژووی شارستانیەتی بەشەری دابەش کرد بە شێوە گشتی‌یەکەی بۆ سێ ماوە بەپێی شوێنی ئاو لە ناوچە جوگرافیەکەیدا ئەویش:

ا-ماوەی شارستانێتی کۆن کە لە لێواری ڕووبارەکانەوە دەست پێ‌دەکات وەك شارستانێتی (وادی الرفدین) و (الرافدین)و ئەو شارستانیەتانەی کە لەسەر لێواری ڕووبارەکانی ڕۆژهەڵاتی خوارو دروست بوون بە تایبەتی لە (هند) و (چین) ئەو ماوەیە بە (Potamic) ناونرا،

ب-قۆناغی دووەم- گوێزانەوەی شارستانیەتە بەشەریەکان لە لێواری ڕووبارەکانەوە بۆ لێواری دەریاکان کە شارستانیەتی تیا دەرکەوت وەك

شارستانیەتی فینیقینی و یۆنانی لەسەر لێواری دەریای ناوەڕاست ئەو قۆناغەش ناونرا "Thalassic".

جـ-لەم قۆناغەدا بنەمای شارستانیەتەکان گوێزرانەوە بۆ زەریاکان دەوڵەتە گەورەکان سەریان هەڵدا لە ئەوروپا ولاتە یەکگرتووەکان و ڕۆژهەلاتی ئاسیادا و ئەم قۆناغەش ناونرا "Oceanic".

٢-ڕا وا هەیە کە دەڵێن جەمسەری شارستانیە بەشەریەکان هەمیشە دەچن بەرێوە لە ناوچەی خوارووە گەرمەکانەوە بەرەو ناوچەی شیمالی سارد لە تۆپی زەوییەوە.

٣-ئەو ڕایەش کە مامۆستا (Zensser) کە زانای بکتریولوژی ئەمریکی هاوچەرخ بانگەشەی بۆ دەکات و دەڵێ (کە مێژووەکان و باو مکروبات و تاعون) ئەو جۆرانە دەمرن و گەشە دەکەن و بلاو دەبنەوە بە هۆی هۆکاری دەوروبەرو جوگرافیاوە) ئەوەیە کە ڕووی مێژووی مرۆڤایەتی بە لایەکی تردا دەبات و جەمسەرە شارستانیەتە بەشەریەکان دەگوازرێتەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، مامۆستا "Zensser" تیۆرەکەی لە کتێبێکدا پەخش کردووە لە ژێر ناونیشانی (مشك و ئەسپێ لە مێژوودا) بۆ بابەتەکەی هەندێ نموونەی مێژوویی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی بسەلمێنێ.

## ڕاڤەکردنی ڕۆحی بۆ مێژوو:

ئەم جۆرە ڕاڤەکردنە لای هیگڵ پەرەی سەند لەوکاتەدا کە ژیاوە لە ئەورووپا لە ماوەی جەنگەکانی ناپلیۆندا دەژیا هەروەها بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی شۆڕشی فەرەنسی، ڕاڤەکردنی مێژوو لای هیگل پەیوەندی پتەوی هەیە بە فەلسەفە گشتی‌یەکەیەوە هەروەها بۆچوونەکەی بۆ گەردوون و کۆمەڵ و مرۆڤ، دەتوانین بڵێین کە گەردوون لە بۆچوونی هیگڵدا بە یەکەیەکی فرەیی بەش بەشی بەناویەکدا چوونە کە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی گرتۆتەخۆ واتەی گەردوون لە یەکە بچووکەکان دروست نەبووە (وەك چۆن مرۆڤ لێکی داوەتەوە) کە پەرش بووە بە فەزادا وەك دارو خەڵك و ماڵ و لەو شێوانە بەڵکو یەکەی بچووکە لە بەشی جیهانی گشتی‌دا لەسەر ئەم بنچینەیەش پێویستە لەو بەشانە بکۆڵینەوە کە (وەك پەخش بوو یەك وایە لە فەزادا کە مرۆڤ بە هەستەکانی دەرکی پێدەکات بە شێوەیەکی هەمیشەیی ئەمەر ئەگەر بمانەوێ تێبگەین لە ڕاستی‌یەکانیان) کەوابێ پێویستە پەیوەندی

بەشەکان بە بەشەکانی ترەوەو بە گشتەوە کە بەشێکە تیایدا بکۆڵێنەوە، بەڕای هیگڵ ئەو گەردوونەی کە هەستی مرۆڤایەتی دەرکی پێدەکات ناتەواوەو (ناقص) دەگۆڕدرێ ئەگەر بە خودی باڵا پێوانە نەکرێ یان هێزی ئاسمانی کە دۆزیویەتەوە، خودی باڵاو ئیرادەی زیرەك یان گەردوونی دروست کەر (خودا) بە رای هیگڵ یەکەم قۆناغە لە دروست بوونی جیهاندا واتە بوونی بوونەوەرە، شتێکی تەواوە لە دروست بوونیداو سەرچاوەی خێرو حەق و جوانی لە کاکڵەکەیدا (سام)ەو هەستەکانی مرۆڤ درکی پێناکات گەر موستەحیل بوایە خەڵکان اکنهە دەرك پێبکەن بە دەرکێك هەستی و زیرەکی ئەوا ناویان لەسەرو باڵای هەست و بیریانەوە دادەنا خۆیشی ناچار دەبوو کە خۆی پیشان بدات بۆ خەڵکان لە رێگای دروستکراوەکانیەوە بۆ دژایەتیەکانی کە جیهانی سروشتی‌یە ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژین یان ئەو گەردوونەی کە هەستەکانمان درکیان پێ دەکەن، بەڵام دوای غایەی ئەو دروست کراوە ئەوەیە بەرزکردنەوەی گەردوونە بۆ سەرەوە کە تیایدا دەژین. بۆ پلەیەك کە بگاتە پلەی دروست کەری بۆ گەیشتن بەوە گەردوونێکی سێهەم دروست دەبێ نزم تر لە پلەی دروست کەر ناسراوتر لە ئاستی گەردوون کە تیایدا دەژین، فەلسەفەی مێژوو لای هیگڵ لەسەر بنەمای گشتی فەلسەفەکەی دەمەزراوە، مێژوو لە بۆچوونی ئەودا کۆمەڵێ رووداو نیە (سروشتی یان کۆمەڵایەتی) لەبەرئەوەی ئەو رووداوانە گرێ دراون بە گەردوونەوە ئەو گەردوونەی تیایدا دەژین، بەڵکو مێژوو ئەو بیرەیە کە

ئەو ڕووداوانەی هێنایە پێش، هیگڵ ئەو بیرە بە بیری ڕەها ناودەبا یان ئاوەزی ڕەها کە لە پەستمۆلۆژیەکەیدا بەرەنگاری سنووری زەمان و شوێن دەبێتەوەو ناوی لێ دەنێ، سەرو هەموو شتێ، دامان نا کە ئاوەزی ڕەها کە ناو دەنرێ بەسەرو سنووری زەمان و شوێن بۆ مێژوو کە ڕووداوەکەی سنووری زەمان و شوێن نیە، ئاوەزی ڕەهاش کە هەمووی خێرو چاکەیە (کە سەرچاوەی یەکسانی و سەربەستی و جوانی‌یە) دیارە لەسەر ئەو بنچینەیە مێژوو هەمووی خێرو یەکسانی‌یە، (ڕووداوەکانیش کەوا لە مرۆڤ دەکەن وەك ئەوەی شەڕ بن) ئەمەی دوایی وای لە خەڵکان کرد کە تێگەیشتنیان لێڵ بکات لەبەرئەوەی لە جیهانی غەیبانیەت تێ نەگەیشتوون، مێژووی ئاوەزی ڕەهاش (سام)ە لە کاکڵەو مەبەستەکەیدا موستەحیلە لەسەر مرۆڤ کە (کنهە) دەرك پێبکەن، ناچار دەبوو کە خۆی ئاشکرا بکات بۆ خەڵکان لە ڕێگای دروست کەریەوە بۆ دژەکەی، ئەو دژەش ڕوادوەکانە (سروشتی یان کۆمەڵایەتی کە لەو گەردوونەدا ڕوودەدەن کە تیایدا دەژین) کە (هەڵە)ی پێ دەڵێن لە مێژودا، ئەوە جوانترین دیاردەیە کە ڕای هیگڵ خستیەڕوو لە ڕۆژهەڵاتی خوارو سەرەوەدا لە سەردەمی خۆیدا، خەڵکان بۆ ئیرادەی کەسێك کە بڕیاردەرە یان بۆ سوڵتانێك مل کەچ دەبن یان بۆ ئەو فەرمانەی کە سەربەستی خەڵکان زەوت دەکەن کە بەرژەوەندیان دەشێوێنێ و تەنها خۆیی و دارودستەکەی سەربەستی ڕەهایان پێ ڕەوا دەبێ بۆچوونی هیگڵ بۆ ئاوەزی ڕەها کە دەیەوێ بەرز بێت بۆ ئاستێکی باڵای بەشەری لە هەموو

لایەنێکەو،، گەلی ئەڵمانی دروست کرد وەك بازنەیەکی نێوەندی لە نێوان مێژوی ڕەماو مێژووی ڕۆژهەڵاتی خوارو سەرو، لەسەر گەلی ئەڵمانیش پێویستە مل کەچی ڕەها بن بۆ سیاسەتمەداریان و ئەو سەرکردانەی کە خواوەند عەلیانی بژاردووە بۆ ئەوەی نەتەوەکان ڕزگارکەن و بیانبەنە ژیانێکی باشتر، لەسەر ئەو بنچینەیە گەلی ئەڵمانی خاوەن پەیامێکی ئاسمانی ئەبێت و دەبێت بە خەڵکی ڕابگەیەنێت بۆ ئەوەی لە تاریکی‌یەوە بیانباتە ڕووناکی، ڕای هیگڵ وایە کە سەرکردە ناتوانێ بە ئیرادەی خۆی مێژوو دروست بکات، یان ڕەوتی بگۆڕێ بەڵکو ئەو تەنها ئیرادەی خوداوەند جێبەجێ دەکات و ڕۆڵی تایبەتی دەبینێ لە کۆمەڵگادا هەروەها دوایش بەپێی ئەو ئیرادەیە نامێنێ، لێرەدا وا دەردەکەوێ کە سەرکردە زۆرجار نوشوست دەهێنێ لە جێبەجێکردنی پەیامەکەیدا، بە ڕاستی ئەو لە ڕووی خودی باڵاوە نوشوستی نەهێناوە کە ویستویەتی ئەو کارەی پێی هەڵسێ کە پێی هەستاوە، سەرچاوەی نوشوست هێنان دەگەڕێتەوە بۆ کەم بوون لە دەسەڵاتدا نەك بۆ سروشتی کارکردنەکەی، هیگڵ وای دەبینێ کە دروست بوونی مرۆڤ لە ڕوکارێکی تەواوەوە نیە تەنها لە ڕێگای ئەوەوە نەبێت کە مل کەچ بکات بۆ دەزگا کۆمەلایەتیەکان و لە پێشیەوە (لە دروست بوون و بایەخیەوە نەبێت) دەوڵەت، کۆمەڵ، خێزان و سیستەمی دین و فەلسەفەیی و زمانی و زانستی و هونەری و... هتد، هیگڵ دەڵێ کە دەوڵەتان جیاوازن لە یەکتری بەهۆی دروست بوون و بایەخیانەوە دەوڵەتی بروسی پێشەوایە لە دیدی

ئەودا بە پێویستی دەزانێ بۆ پێشکەوتنی بەشەریەت ھەقی خۆیەتی کە بڕیار بدات و دەوڵەتانی تر گوێ بۆ فەرمانەکانی شل بکەن ھەقی خۆشیەتی کە جەنگ بەرپا بکات لەگەڵ دەوڵەتانی تردا چ کۆمەڵ بن یان تاک دەوڵەت بن (ھەرکاتێك پێویست بکات) بۆ ھێنانەدی پەیامەکەی بەڵام دەوڵەتانی تر مافیان نیە جەنگ بەرپابکەن دژی دەوڵەتی بروسی گەر وابێ ئەوا یاخی بوون سەرھەڵدەدات، ھیگڵ وای بۆ دەچێ کە ھەموو دەوڵەتێك بەلای خەڵکانیەوە بەرزن و ڕێزی ھەیەو پێویستە لای تاکەکانی گەلەکەیان جێی شانازی بن و پێویستە لەسەر خەڵکان مل کەچ بکەن بۆ دەوڵەت و ڕێزی لێ بگرن دەرچوون لەو سیستەمەو دەرنەچن تا بە سەربەستی خۆیان دەگەن، ھیگڵ وای دەبینێ کە شۆڕشی گەل دژی دەوڵەت دەرچونە لەو سیستەمەو پێشێل کردنی ڕێبازی سەربەستییە کە خۆیەتی، بەڵام ھیگل وای دەبینێ کە ھەندێ جار جەنگ لە نێوان دەوڵەتاندا پێویستە ئەمەش بە دواداچوونی ئیرادەی خوداوەندە، یەکەم دەوڵەتیش کە نوێنەری ئیرادەی ئاسمانە دەوڵەتی بروسیە کە ھەر خۆی مافی ئەوەی ھەیە کە بانگ ھێشتی جەنگ بکات دژی دەوڵەتانی تر ھەر کاتێك پێویست بێت.

## ڕاڤەکردنی مەتریالیزمیانە بۆ مێژوو:

ڕاڤەکردنی مەتریالیزمی بۆ مێژوو لە لایەنی فەلسەفی‌یەوە پێی دەوترێ مەتریالیزمی مێژوویی، مەتریالیزمی مێژوویش خۆی بە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی ناسراوە کە (کارل مارکس) و (فردریك ئەنگلس) دۆزیانەوە لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ ڕاڤەکردنی سروشتی دەوڵەت و پێگەیشتنی و بایەخی لە لایەکەوە بۆ ڕاڤەکردنی پێکهاتەی کۆمەڵ لە دوو لایەنەوە ڕامیاری و ئابووری لە لایەکی ترەوە بۆ ڕاڤەکردنی مێژوو و هۆکاری ڕووداوەکان لە ڕوویەکی ترەوە، مەتریالیزمی مێژوویی لایەنێکی کۆمەڵایەتی‌یە لە مەتریالیزمی دیالەکتیکدا کە فەلسەفەی گشتی مارکس و ئەنگلسە کە لە سروشت و گەردوون و یاسا گشتی‌یەکان دەکۆڵێتەوە مەتریالیزمی فەلسەفی و مەتریالیزمی مێژوویی پێکەوە پێوەندی ئۆرگانیکیان هەیەو لە کۆی خۆیاندا (فەلسەفەی

مارکسیتی) پێك دێنن چونکە بی تێگەیشتن لە مێژووی کۆمەڵ لە باری مادیەوە دەرکی مادی جیهان، تەواو نابێ و ئەمەش کارێکە کە بە هۆی (مارکس ١٨١٨-١٨٨٣) و (ئەنگلس ١٨٢٠-١٨٩٥)ەوە بە ئەنجام گەیشت و مەتریالیزمی شێلگیر سەری هەڵدا پێش مارکس و ئەنگلس تەنانەت مەتریالیستەکان لە شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی مێژوویی‌دا ئایدیالیست بوون و زە ین پەرست و وا بیریان دەکردەوە ئەوە بیرو ئیرادەی پیاوای گەورەو هەڵبژاردراوی کۆمەڵایەتی یان بیروباوەڕی گشتی‌یە کە مێژوو هەڵدەسوڕێنن واتا بە کردەوە شعورو زانیاریی کۆمەڵیان بە خولقێنەری بوونی مادی و ئابووری کۆمەڵ دادەنا نە بە پێچەوانە مەتریالیزم لە مەتریالیزمی مێژوویی‌دا بەو شێوە خۆ دەنوێنێ کە لێرەشدا بەرهەم هێنانی مادی‌یەکە دەوری دیاریکەر لە گەشەکردنی کۆمەڵ دا یاری دەکا، نەك ژیانی مەعنەوی کە خۆی لایەن لق و پۆپی و دابڕاوی هەیە هەر بۆیە بناخەی لە پێش بوونی مادەو لە پاش بوونی شعور کە بناخە نـاوەندیی کۆڵەکەی بنەڕەتی مەتریالیزمە لەگەڵ مەیدانەکانی مێژوو کۆمەڵدا دەقاودەق دێتەوە، ئەو یاسایانەی کە مارکس دایڕشت بۆ ڕاڤە کردنی گەردوون لەمانە پێك دێت:

أ-یاسای سێ دیاردەکە: دژایەتی‌یەکان و کاریگەریە چون یەکەکان یەکەی دژایەتی‌یەکان: هەموو بوونێك لە سروشتدا لە مەسەلەی مادی هەست پێکراوە یان بیری ئەبستکراد دوای شیکردنەوەی دەتوانین

بیگەڕێنیـەوە بۆ توخمە دژایەتیەکانی لە پێکهاتەکەیدا سەرەڕای ئەوەی ئەو توخـانە دژن لە دروست بوونـی سروشـتیاندا یـەکگرتنیان شـێوەی فریاگوزاری و کاتی دەردەخات واتە ئەو یەکەی ك دەبینین لە ڕووداو و بیردا یان لە شتە مادیەکاندا شتێکی کاتیـیەو ئامادەی لێك ترازانە لە هەموو چرکەیەك لە چرکەکانی بووندا لەمەش گۆڕان دروست دەبێت ئەو گۆڕانەش یاسای گشتیـیە کە مل کەچ دەکات بۆ کارتێکردە لە هەموو هێزی سروشتیدا لەگەڵ ئەم لۆژیکەدا جێگیری حاڵەتێکی فریاگوزاری دەبێت کە بوونێکی کاتی هەیە هەموو شتێ لە سروشتدا مێژوویـەکی تایـبتی هەیـە لـە پـەیوەندی بەشـەکان بەیەکـەوە، پـەیوەندی هـەموو شتەکان بـە شـتەکانی تـرەوە لەبەرئـەوەی هـەموو شـتێ لـە سروشـتدا دەگۆڕێ نەنها گۆڕان نەبێ کە ناگۆڕدرێ،

ب-یاسای گۆڕان چەندایەتی بۆ چۆنایەتی و بە پێچەوانەوە:

وای دەبینین کە هەموو شتێ لە سروشتدا لـە گۆڕانێکی هەمیشەیی‌دایە واتە کەشتەکان دەگۆڕدرێن لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر جاری وایـە بۆ چۆنایەتی یا بۆ چەندایەتی، لەسەر ئەم بنچینەیـە ئەو گۆڕانەی کە بەسەر قەوارەکەیدا دێت وەك شتێکی حەتمی ئەو قەوارەیە دەگۆڕدرێ لە ڕێی ڕوودانی سیفەتە نوێکانەوە کە شتە نوێکە دەگرنە خۆ هەروەك چۆن سیفەتی کۆنی هەبوو لە پێشدا هەر لە ڕێی ئەو سیفەتە نوێیەوە شتە کۆنەکە دەگۆڕدرێ بۆ شتێکی نوێ کە زۆر جیاوازە لە کۆنەکە، بۆ

جیاوازی له نێوان گۆڕینی چەندایەتی و گۆڕینی چۆنایەتی دەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە یەکەمیان زیاترو کەمتر هەڵدەگرن لە شتەکان خۆیاندا یان لە بڕەکەیدا بەڵام گۆڕینی چۆنایەتی گۆڕینی شتی کۆن بۆ شتی نوێ هەڵدەگرێ کە زۆر جیاوازە لێی لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵام گۆڕینی چەندایەتی زۆرجار گۆڕینی چۆنایەتی لێ پەیدا دەبێت و بە پێچەوانەشەوە، بۆ ئەوەی کە شتێك بگۆڕدرێ لە لایەنی چەندایەتیەوە بۆ شتێکی تر کە لە خۆی جیاواز بێت جیاوازیەکی چۆنایەتی پێویستە حاڵەتی گۆڕینی بگاتە گوێزانەوە یان بگاتە پلەکەی زۆر جار ئەو ڕووداوە وەك شتێکی کت و پڕیش ڕوودەدات یان به خێرایی ڕوودەدات ئەگەر نمونەی ئاومان هێنایەوە کە دەگۆڕدرێ بۆ هەڵم ئەوکاتەیە کە پلەی گەرمی دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو کە کاری گۆڕینی تیا دەگرێتەخۆ کە بەشەکانی ئاوی لێ دروست دەبێت خێرایی زیاد دەبێت ئاکامی زیادبوونی پلەی گەرمی کە لەگەڵ کردارەکەیدا لێك دەدات کە ئاویش لە حاڵەتی شلیدایە هێزی ڕاکێشکەر لە توانایدایە لە نێوان بەشەکانی لکاندن ڕووبدات لەنێو ئەو بەشانەدا لەوانەیە ئەوە ڕووبدات.

گەر پلەی گەرمی ئاوەکە زیاد بکرێت ئەوا هەندێ لەو بەشانە دەردەچن و مەیلی جیابوونەوەیان دەبێت، ئەگەر زیاتر پلەی گەرمی بەرزبکرێتەوە ئەوا ئەو بەشانە کە مەیلی جیابوونەوەیان هەبوە هەندێکیان دەبنە بڵق و دوایش بەرزدەبنەوە بۆ نێو فەزا لە شێوەی هەڵمدا ئەو هۆیەش

دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ململانێیەی لە نێوان ئەو دژانەی هەیە لە سروشتی کتریە ئاوەکەدا ئەو ململانێیە مارکسیەکان وای ڕاڤە دەکەن کە لەنێو شتی کۆنی (ئاو)و شتی نوێ (هەڵم)دا ڕوودەدات.

جـ-یاسی نەی نەی لێکراو (نفی النفی):

لە دیالیکتیکدا چوار یاسای زەق هەیە: یاسای پێوەندی و گەشەکردنی گشتی/ یاسای تێپەڕبوون لە ئالوگۆڕە چەندییە پلە بە پلەو بەرەبەرەییەکان و گەیشتن بە ئالوگۆڕی چۆنایەتی لە ناکاو یاسای یەکبوون و خەباتی دژەکان یاسای (نفی النفی) مارکس دەڵێ (هەر بەرەو پێش چوونێك سەربەخۆ لە ناوەڕۆکی ئەو دەکرێ وەك زنجیرە هۆیەکی جۆراوجۆر لە بەرچاو بگرین لە پێوەندی ئەو زنجیرانە لەنێو خۆیاندا بە جۆرێکە کە یەکیان نەی ئەوی تریانە (واتا یەکیان نەفی ئەو تر دەکات) نەفی نەفی کارێکە کە مادە تیایدا شیدەبێتەوە بۆ بەشە جیاوازەکانی کە جۆرە سروشتێکی لێك دوورخراوە دەگرێتەوە (بەپێی لۆژیکی یاسای یەکەم) لەبەرئەوەی هەموو نەی لێکراوێك لەگەڵ خۆیدا چرۆی نەی لێکراوی هەڵدەگرێ یان دژایەتیەکەی هەڵدەگرێ، لای مارکسیەکان نەی لێکراو لە کاکڵەکەیدا هۆکارێك نیە بۆ داڕوخان، بەڵکو توخمێکە لە توخمەکانی نوێبونەوەو بیناکردن واتە ڕوودای نوێ دەهێنێتە ئاراوە کە لە کۆن ڕێك تر بێت، بەڕای مارکسیەکان نەی لێکراو کۆن دانارمێنی وەك حەتمیەتێك بەڵکو توخمە جودابووەکانی دەردەهێنێ و ناوچە شل و

شێواوەکەی لادەبات کە لە قەوارەکەیدا هەیە بەمەش توخمە بەهێزەکەی دەپارێزێ کە دەتوانرێ نوێی لێ پەیدا ببێت و بۆ خۆی هەڵی دەگرێ، بەو شێوەیەش نوێ کە لە نەی لێ کراوەوە پەیدا بووە وای لێ دێ دەبێتە شتێکی نوێ یان شتێکی نوێی لێ لەدایك دەبێ کە باشتر ڕێك تر دەبێت لەوی دی ئەمەش ئاکامی نەی نەی لێکراوە. بە ڕای مارکسیەکان نەی لێکراو هۆکارێکە لە هۆکارەکانی پێشکەوتن هەروەها نەی نەی لێکراو هۆکارێکی پێشکەوتنە کە ئەویش پەیوەستە بە مەتریایزمی دیالەکتیکەوە بەلاَم پراکتیزەکردنی ئەو فەلسەفەیە بەسەر کۆمەڵدا بە مەتریالیزمی مێژوویی ناسراوە کۆمەڵ لە دیدی مەتریالیزمی مێژوویی‌یەوە مل کەچە بۆ سێ یاساکەی کە باسمان لێوەکرد، کۆمەڵ لە دوو چین پێك هاتووە دوو چینی دژبەیەك لە بەرژەوەندی ئارمانجدا، چینێکی بۆرژوازی مستغلە کە لە خاوەن سامان پەیدابوون و چینێکی تر پرۆلیتاریایە مستغلە کە هەر لە خۆیەوە کارناکات بەڵکو خاوەن سامان کاری پێ‌دەکات، مارکس و هاوڕێکانی لە خاوەنانی ڕاڤەکردنی مەتریالیزمی مێژوویی دەڵێن کە هۆکاری ئابووری تاکە هۆکارە کە کاریگەری خۆی هەیە بۆ پەیوەندیەکانی نەتەوەو گەلانەوەو ڕەوتی مێژوو دەگۆڕێ، مەبەستی هۆکاری ئابووری کە شێوەیەکە لە کەرەستەکانی بەرهەم و یاسا موڵکایەتیە باوەکان ئەمە لە لایەك و لەلایەکی ترەوە ئەو سیستەمە کە دابەش کردنی سامان و قازانجەکان

ملی بۆ کێچ دەکەن لە نێوان بەرھەم ھێنەران و موڵکدارەکاندا ھەروەھا سەربەخۆکاندا لە لایەکی ترەوە، ھۆکاری ئابووری لە دیدی ئەواندا پێکھاتەی کۆمەڵایەتی و سیستەم و شێوەی ژیان و فەلسەفەکەی دەگۆڕێ، ھەر جیاوازیەك لە کۆمەڵگادا لە یاساکانی دروست بوونیداو فەلسەفەی کۆمەڵایەتیدا دیاردەیەکە لە دیاردەکانی جیاوازانە لە جۆری ژیانی ئابووری و باو تیایدا، مارکس و ھاوەڵەکانی ھاوشێوە لێك چوونەکان لەنێو ھەندێ کۆمەڵگادا لێك دەداتەوە بەھۆی یاسا دروست کەریداو، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ژیانی ئابوریان دەگەڕێنێتەوە، کەواتە دەردەکەوێ کە ڕاڤەکان مەتریالیزمی بۆ مێژوو کۆمەڵگای بەشەری دابەش دەکەن لەسەر بنچینەی سیستەمی ئابووریە باوەکەیان نەك لەسەر بنچینەی جوگرافی یان توخمی زمان، واتە ھۆکاری ئابووری کاریگەری دەخاتە سەر کۆمەڵی بەشەریەت نەك کاریگەری ھەبێ لەسەری، وای دەبینن کە ھەر ڕووداوێك لە سیستەمی ئابووری کۆمەڵێك لە کۆمەڵگادا وەك شتێکی حەتمی بەرەو گۆڕانی گەورە دەچێ لە ھەموو دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا سیستەمی سیاسی، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان فەلسەفە دروست کەرەکان و دینیەکان ڕاڤەکەرانی مەتریالیزمیەت وای دەبینن کە ھەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی بەشەریەت پێی تێپەڕیوە لە پێشکەوتنەکانیدا لە لایەنی ئابووریەوە (بێجگە لە کۆمۆنەی سەرەتایی) ڕاقی ترین قۆناغە لە قۆناغی پێش خۆی، نمونەش

قۆناغی دەرەبەگی شازترە لە قۆناغی کۆیلایەتی زەوی ی سەرمایەداریش شـازترە لـە دەرەبـەگ بـەو شـێوەیە هـەموو قۆنـاغێك لـەو قۆناغانـە گۆرانکاریـەك هـاتووە بەسـەر کەرەسـتەی بەرهـەمدا هـەروەها بـە دوایـدا پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە باوەکانیش گۆراوە کە ململانێیەکی توندی پێوە دیـاربووە لـە نێـوان کەرەسـتەی بەرهەمـە نوێکـانو لـە نێـوان جـۆری پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیـەکاندا ئـەوەی کۆمـەڵگا بـۆی ماوەتـەوە لـە باوباپیرانەوە کە لە قۆناغی ئابووری پێشوودا دەژیـان کـە جۆرو شێوەی کەرەستەی بەرهەمیان جیاواز بووە لە قۆناغی نوێ، ئەوەش وا دەکات کە ئەو پەیوەندیانە لەمپەرێك بێت لە بەردەم گەشەی کۆمەڵدا کە خۆی لە سـەردەمی کۆنـدا یەکـەم هـۆی پێشـکەوتن بـووە، ئەمـەش بەندە بە هـۆی پـەیوەندی کۆمەڵایـەتی و کەرەسـتەکانی بەرهـەم تـا دەگاتـە قۆنـاغی سوشیالیزم بۆ ئەوەی مێژوونوس کە دەیەوێ لە مێژوو بزانـێ یـان لـە مێژوو بکۆڵێتەوە دەبێ پێش هەموو شتێ جۆری ژیـانی ئـابووری باوی کۆمەڵگا شیبکاتەوە دوایش بچێتە نێو لێکۆڵینەوەی دیاردە ژیانیەکانی تر /سیاسەت/ دین.. هتد، لەبەرئەوەی ژیانی ئابووری لە دیدی ئەواندا یەکەم بنچینـەی متمانە پێکراوە کـە هـەموو دیاردەکـانی ژیـانی تـری لێ پـەیدا دەبێـت، کـەوابێ مێـژوو بـە سـیفەتی گشـتی پێشـکەوتنی رۆح لـە زەماندا و هەروەها سروشتیش پێشکەتنی هزرە لە شوێندا.

## ڕاڤەکردنی سووری (الدوری) بۆ مێژوو:

هەندێ لە مێژوونوسان هەن لە پێشیانەوە (ابن خلدون) هەروەها مێژوونوسانی سەدەی نۆزدەهەم وەك نیکولای دانیلیفزکی روسی و مێژوونوسی ئەڵمانی شنبکلرو توینبی ئینگلیزی وای دەبینن کە ڕەوتی مێژوو بەپێی سیستەمێکی تایبەتی بەرێوە دەچێ، ئەگەر ڕوخاندنی دەوڵەت سروشتی بێت ئەو ڕووداوە بە ڕووداوێکی سروشتی دێتە بەرچاو وەك چۆن لە مەزاجی ئاژەڵیدا هەیە کەواتە ڕووخاندن نەخۆشی یەکی قورسە ناتوانرێت چارەسەر بکرێت یان بەرزبکرێتەوە، مێژوونوسی ڕوسی (Nikolai Danilevis) لە کتێبەکەیدا کە ساڵی ١٨٦٩ دایناوبو وای دەرخست کە هەموو مێژووی مرۆڤایەتی لە (کۆمەڵێك ڕۆشنبیری مێژووی جیاوان) پێك دێت بۆ هەریەکەشیان تایبەتمەندی و ڕۆڵی خۆی هەیە لە بەرەو پێش چوونی مرۆڤایەتی لە هەموو لایەکەوە ئەو کۆمەڵانە بە دوانزە کۆمەڵە دیاری دەکات کە سەریان هەڵداوە وەك

کۆمەڵەی ڕۆشـنبیری میسـری و چینـی ئاشـووری و بـابلی و فنقینـی و سامی کۆن و هندی و ئێرانی و عیبری و یۆنانی و ڕۆمانی و سامی نوێ یان عەرەبی و ئەڵمانی و ڕۆمانی و یان ئەوروپی و هەروەها ڕۆشنبیری نیوەی زەوی ڕۆژئاوا بە تایبەتی مەکسیکی، ئەم مێژوونوسە ڕەگەزی بەشەری دابەش کرد بەپێی ئاڵ و گۆڕ کردن لە ڕووداوە ڕۆشنبیری و شارستانیەکاندا بۆ سێ بەش، بەشی یەکەمی ناونا بە گەلە ئەرێیەکان یان لە گەلە داهێنـەرەکان کـە شارسـتانیەت لەسـەر شـانیان دامـەزراوە بەشی دووەمیشی ناونا بە گەلە نەرێیەکان یان گەلە تێکدەرەکان وەك مـەغۆل و هـون و تورکـەکان بـە تایبـەتی (لـە یەکـەم پێکهاتـەی کۆمەڵایەتیاندا) ناوی بـەش سێهەمیشـی ناونـا کـە نـە تێکـدەرن و نـە داهێنـەرن لـە خۆیانـەوە بەڵکو چـاورەێی ئـەو گەلانـە دەکـەن کـە لێـیان وەردەگرن، بەڵام مێژوونوسی ئەڵمانی (اوسکار شینکلر) کە لـە نێـوان سـالانی (١٨٨٠-١٩٣٦)دا ژیـاوە وای دەبینـێ ڕۆشـنبیری لـە سـووری ژیانیداو پێشکەوتنیدا بە چوار قۆنـاغدا تێدەپـەرێ وەك وەرزی سـاڵی کەش وەك سووری منداڵی بە (بەهار) وێك دەچێنێ کە لایەنی سیاسی و ئـابووری دەگرێتـەخۆ ئـەویش بـە بڵاوبوونـەوەی دەرەبەگایـەتی و دەسەڵاتی دەرەبەگ لە بڕیارداندا بۆ سەر کۆمەڵ لە هەموو لایەنێکەوە، ڕۆڵی هێزو گەشەکردن بە (بەهار) وێك دەچێنێ کە ئەمەش گوێزانەوەی دەسەڵاتە لە لادێوە بۆ شار کە پیشەسازی پەرەدەستێنێ و دەبێتە هۆی

گوێزانەوەی سامان لە دەسەڵاتی دەرەبەگ بۆ دەسەڵاتی چینی ناوەند لە بازرگانەکان، ڕۆڵی هەڵوەرین و داڕمان بە (پایز) وێک دەچێنێ ڕۆڵی پوکانەوەی توانەوە بە (زستان) وێک دەچێنێ، هۆکاری ئەو گۆڕانانە دەگەڕێنێتەوە بۆ شتە غەیبیەکان کە پێویست ناکات بزانرێ لەم حاڵەتەشدا دیاریکراوە کە کاریگەری فەلسەفەی هیگڵ لەسەر شبنکلر بووە بۆ ڕاڤە کردنی مێژوو، شبنکلر لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەژێر ناوی (داڕمانی ئاوا)دا کە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا نوسیەوە دەڵێ (هەموو ڕۆشنبیریەك وێك دەچن لە لایەن گەشەکردن و پێشکەوتنیدا) بە لەشی مرۆڤ کە ڕەوتی ژیانی بە چەند گۆڕانێك تێدەپەڕن، قۆناغەکانیش قۆناغی منداڵێ وەك چۆن لە باری کۆمەڵگا دواکەوتووەکاندا لە لایەنی ڕۆشنبیریەوە دواکەوتوون و دوایش سیستەمی سیاسی و سەربازیان گەشەدەکات و هۆشیاریشیان گەشە دەکات و پێش دەکەون بۆ قۆناغی چوارەم واتە شارستانیەت یان مەدەنیەت (Civilzation) کە تایبەتمەندێتی خۆی هەیە جیاوازی دەکات لەوانی تر، لەم کاتەدا کە (ماوەی کاتی شارستانیەتە)، ڕۆشنبیریش پێش دەکەوێ لە ماوەی پێش ڕۆشنبیریدا، کە ماوەی کات و شوێنیە کە کاریگەری ڕۆشنبیری پێوە دیار نیە بەڵام خەڵکان دەبینین کە لە جاهلیەتی سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتیدا دەژین، هەموو ڕۆشنبیریەك پاڵ بە ڕۆڵی پێگەیشتووی خۆی دەبەستێ (لە ماوەی ڕەوتیدا بۆ گەیشتن بەو پێشکەوتنە) لەسەر بنچینەی هێزی

گشتی یان ڕێبازێکی تایبەتی کە جیاوازی دەکات لەوانی دیکە ئەمە لە
لایەك لە لایەکی ترەوە هەموو دیاردە ژیانییەکانی کۆمەڵ بە یەك دەگات
شـبنکلر ئـەم هـزرە گشـتییە ناودەنـێ "Prine Symbolor Premise"
لێکدانەوەی شارستانیەتی بەشەری کۆن و نوێ دەگاتە ئەوەی کەو ئەو
شارستانیەتانە نۆ شارستانیەتن (شارستانیەتی میسـری کـۆن و وادی
الرافدیـن و چین و هنـدی و فارسـی و یۆنـانی و ڕۆمـانی و ڕۆژئـاوایی
(مەسـیحیەت) و شارسـتانیەتی ئیسـلام و شارسـتانیەتی مەکسـیکی،
شارستانیەت ڕەزامەندی خوداوەند دەهێنێتە کایە بۆ ڕەوتی کۆمەڵ لەم
ڕەوشەدا یان لە کۆندا بۆ ڕەوشێکی ڕاقی تر کە خوداوەند دەیپارێزێ،
کە ڕۆڵی سەرکردەی تیادا دەبینرێنەوە بۆ دەست پاکی لـە جێبەجێ
کردنـی ئـەو ئیرادەیـەدا، دوایـش ڕۆڵـی پاڵـەوان یـان سـەرکردە کۆتـایی
دێتو ڕۆڵی شارستانیەتیش کۆتایی دێ کە خوداوەند هەڵێ بژاردووە
بۆ خزمەت کردن ئەو کاتەی شارستانیەت خۆی پەیدا دەبێ (بەپێی
ئیرادەی خوداوەند، ئەویش بەهۆی خۆ لول کردن بە دەوری خردا کە زۆر
لایەنی نامێنێ و لەناودەچێ لەگەڵ ئەوەشدا شارستانیەت نامرێ دوای
ماوەیەکی تر بەهۆی لێك ترازانەوە کە چەندەها ساڵ دەخایەنێ دەچێتە
حاڵەتی کورت کردنەوە هەروا دەمێنێتەوە نەدەمرێ نە دەژی ژیانیش
گـورج و گـۆل نـابی کـە مـاوەی کـەم بوونەوەکـەی ڕادەوەسـتێ لەسـەر
مەسەلەی غەیبانی ئاسمان لە حاڵەتی کەم بوونەوەو نەمانیدا .ووچاری

هـەوڵدان زۆر دەبێتـەوە بـۆ ژیانـەوەی کـە هـەندێ خـەڵك دەیـەوێ ئـەو شارستانیەتە بژێننەوە بەڵام بێهودە دەبێ تا ئەو کاتەی کە (ڕاو دیدی خوداوەندی) لەسە ربێت بۆ مردنی ئەو شارستانیەتە، (ئەرنۆڵد تویبنبی) مێژوونوسـی ئینگلیزی بەناوبانگ، شارسـتانیەت یـان مەدەنیـەت بـە یەکەی بابەتی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو دەدات. واتە لە دیدی ئەودا مێژوو نـاتوانرێ لێی بکۆڵرێتـەوە بـە لێکۆڵینەوەیـەکی زانسـتی ڕاسـت یـان لێکۆڵینـەوەکان بگەنـە زانینـی ڕەوتـی و هۆکـاری گۆڕانـەکان بێئـەوەی هـەموو شارسـتانیەتێك هەریەکە بـە سـەربەخۆیی لێی نەکۆڵرێتـەوە وەك شتێك لە خۆیدا هەبێت بێئەوەی سەیری ڕەگەزی (جنسی) گەلان بکرێت لە هاوکاریاندا یان ناوچەی جوگرافیان یان زمـان و ڕەنگیـان، هـەر لـە سەردەمی سەرهەڵدانی مێژووی مرۆڤایەتی تا ئێستا شارسـتانیەتەکان لـە سـێ شارسـتانیەت تێنەپـەڕیوە بـەناوبانگترینیان (شارسـتانیەتی مەسیحی و ئیسلامی و هندی) کە بیست شارستانیەتیان پەیامەکـەیان بەجێ هێناو گەشتونەتە دوا قۆناغی گەشەکردنیان لە هەموو دیاردەکانی ژیانـەوە، پێنـج شارستانیەتیشیان (نەگەیشـتونەتە ئارمـانجی خۆیـان بەڵکو لە جێگای خۆیان ڕاوەستاون) کە تویبنـی نـاوی (Civiliz ation Arrested) لێنـان چوار شارسـتانیەتەکەی تـر سـەرەڕای ئـەوەی لـە پێـش ئەوانی ترەوە لەدایك بوون وای دەبینێ کە شارستانیەت پێش ناکەوێ گەر ئەم سێ مەرجەی تیادا نەبێ:

١-بوونی کەمایەتیەکی لە جێنشینان کە بە سیفەتی داهێنەری هزری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازی بەناوبانگ ئەبن مەرجیش نیە هەموو تاکێك لەو تاکانەی کەمایەتیەکان هەڵگری هەموو ئەو سیفەتانە بن، بەڵام پێویستە ئەو کەمایەتیە کەسانی وای تیادا بێت کە خاوەنی بەهرە بێت و جیاوازکاری هەبێت لە ناویاندا بە هۆی کاری داهێنەرانەو هزری سەدەو هەندێکیان داهێنەربن لە کاری کۆمەڵایەتیدا، هێز جێی دڵگرانی نابێ ئەگەر کەسێك هەڵگری هەندێ لەو سیفەتانە بێت.

٢-لە یادیان نەچێت ئەو کەمە ئەتەوانە بۆ خۆ تەرخان کردنی خزمەتی دەسەڵاتدارو وڵات و کۆمەڵگا مەرجی سەرەکیش هاوکاریانە لە نێوان خۆیاندا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەبێ ئارمانجیشیان خزمەتی وڵات و کۆمەڵ بێت و ئاستی درامەتی ژیانیان بەرزکەنەوەو هەروەها ئاستی هزریان بەرزبکەنەوە لە هەموو بوارێکدا، خۆ گونجاندن ڕۆڵی باڵا دەبینێ لە نێوان کۆمەڵ بۆ خزمەت کردنی گشتی بەپێی ڕەوشی مادی و هزری بەپێی پێداویستیەکانی بەرژەوەندی گشتی، واتە کەمایەتیەکان دەبێ هەمیشە ڕووی لە خزمەت کردنی گشتی بێت.

٣-بارودۆخی جوگرافی لەبار لە پێشەوەی کەشی لەبارە (کە نە گەرم بێت نە سارد بێت) بە شێوەیەك کە بوار بدات بە تاکەکانی کۆمەڵ بە شێوەیەکی گشتی و بە چینی دەسەڵاتدار بە شێوەیەکی تایبەتی کە ڕای خۆیان دەردەبڕن ئەویش بە گرج و گوڵیان بە [illegible] لایەنەکانیەوە بە

شێوەیەکی ئەرێیی لە کاتی هەستانیان بە کارە خزمەتگوزاریە باشەکان، ئەو هۆکارانەی سەرەوە بنچینەن بۆ سەرهەڵدانی شارستانیەت و رەوتەکەی، هۆکارێکن پێکەوەلکان و یەك بە یەکەوەو کاریگەری دەکەنە سەر یەکتری ناتوانرێ لە لایەنی پراکتیزە کردنەوە لێك جیابکرێنەوە، ناشبێ یەکێکیان بێ ئەوی تریان بەکاربهێنن یا یەکێکیان پەکی کەوت کاریگەری لەم دەبێتەوە بۆ سەر شارستانیەت (توینبی) مەبەستی ئەوەش دەگەرێنێتەوە بۆ رەوتی کردارەکی خۆ گونجاندن و زاڵ بوون بەسەر دژوارەکاندا بۆ دەستگیرکردنی پێشکەوتنی کۆمەڵ. گەر تەنگ و چەڵەمەش رووبدات، ئەوا رێگای تری نوێ دەدۆزێتەوە بۆ چارەسەرکردن کە گونجاو بێت و بۆ ئەوەی زاڵ بێت بەسەر ئەو تەنگ و چەڵەمانە: ئەویش بەهۆی دەسەڵاتدارانەوە کە رەورەوەی مەدەنیەت بەرەو پێشەوە دەبات، (توینبی لاوازی شاستانیەت وا دەکات گۆرانکاری لە فەلسەفەکەیدا دروست دەبێت لە چینی دەسەڵاتداراندا بۆ بریارەکانی، لە جیاتی ئەوەی بەرەوپێش بچێت بۆ خزمەت کردنی بەرژەوەندی گشتی دەگۆردرێ بۆ چینێکی زاڵ بوو گوێ بە زۆرینەی نیشتەجی بوان نادات، ئەمەش وا دەکات کە ئەو چینە ناتوانن بگەنە ئەوەی دەیانەوێ بەوەش ناتوانن لەمپەرەکان لە بەردەم کۆمەڵدا لابەرن و بەمەش کپ دەبن و شێوازێکی نوێ داناهێنن، بەلام چینی دەسەڵاتدار لە کپ بونیدا لە بەکارهێنانی شێوازی نوێدا بۆ زاڵ بوون بەسەر تەنگ و چەڵەمە نوێکاندا

ئەمەش بەستەڵکی ناگەیەنێ، ئەنجامی حەتمیش ئەوەی مەدەنیەت بە
ڕێگایەکی پلەداردا دەڕوات لە بزاوتە کۆنەپەرستەکاندا لە بە سێ دیاردە
خۆی دەبینێ.
١-مەدەنیەت خۆی دژواری قەوارەی گشتی دەکات بۆ خاڵی لاوازی و
پلەیەتی درێژیان کورت وای لێ دێ کە:
٢-پوکانەوەو لەناوچوون لە زۆر دیاردەکانی ژیاندا دروست بێت،
ئەمەش لە ڕێی خۆیەوە وای لێ دێ کە:
٣-مردنی شارستانیەت و لەناوچوونی شارستانیەت بێت.

# ڕاڤەکردنی هونەری یان جوانی بۆ مێژوو:

جیاواری ئەم ڕاڤەکردنە بۆ مێژوو بە نوێگەریەکەیدا دەردەکەوێ یەکەم کەس کە هێنایە بەرباس و لێکۆڵینەوە (فلاندرز بنتری) ئینگلیزی بوو کە لە کتێبەکەیدا ناوی هێناوەو ئامارژەی بۆ کردووە لەژێر ناونیشانی (گەشەی شارستانیەت) کە ساڵی ١٩١٢ چاپ کرا هەروەها زانای ئەڵمانی (Paul Ligeti) ڕایگەیاند کە پەیوەندی هەیە لە نێوان پەخش کردنی هونەر بە هەموو شێوە جیاوازیەکانیەوە (وەك پەیکەرتاشی و وێنەو مۆسیقا.. هتد و لە نێوان گەشەکردنی شارستانیەت بە هەموو دیاردە مادی و هزرییەکانەوە لە کۆمەڵێ لە کۆمەڵگادا گەر مەسەلەکە وا بێت کەواتە دەبێت یەکێك لەوانە هۆیەك بێت بۆ ڕووداوی ئەوی تر یان نەوەتا هونەر هۆکارێکی سەرەکی‌یە لە ڕووداوی دیاردە سروشتی‌یەکانی تردا یان هونەر خۆی ئەنجامێکە بۆ هۆکارەکان خۆی (بە کۆمەڵی یان بە پەرشی) گەر گەشەی هونەر لەو دیدەوە پێش گەشەی دیاردە شارستانیەکانی تر بێت کەواتە دەبێ خۆی هۆکارێك بێت بۆ سەرهەڵدانی و گەشەکردنی و

پەخش بونیدا، هەڵگرانی ئەو رایە وای بۆ دەچن کە هونەر لە لایەکی ترەوە (وەك کۆ) هۆکاری سەرەکی‌یە لە پێشکەوتنی شارستانیەتدا (بەڵام لە رووی پێکهاتەو بەشەکانیەوە) بە لاوازی دەست پێدەکات لە هەندێ لایەنەوە دوایی ئەو لایەنانە بەهێزدەبن و کاریگەری خۆی دەکات لە هەندێ لایەنەوە دوایی ئەو لایەنانە بەهێزدەبن و کاریگەری خۆی دەکات لە بوژانەوەی لایەنەکانی تری هونەری خۆی بەو شێوەیە، ئەوەش هەریەکە کاریگەری خۆی دەکات بۆ سەر ژیانی کۆمەڵایەتی تر کە زۆرجار لە زۆر لایەنە ئاشکرا نیە دوای ئەوە هونەری بە کۆتی‌یەوە (دوای ئەوەی لە تەواوبووندایەو گەشە دەکات لە هەموو رویەکی جیاوازەوە) کاریگەری خۆی دەکات لە کۆمەڵە شارستانیەکاندا کاریگەریەکی ئاشکرایە هونەر بەپێی پێگەیەکی گشتی گەشە دەکات. سەرەتا هونەری بیناسازی دەست پێدەکات کە پەیوەستە بە خەت کێشانی شارو بینا دروست کردن و پەرستگاگان و پەیکەرەکان و هاوشێوەکانی دوایی ئەو هونەرە گەشە دەکاتو شێوەی تر دەرگێتە خۆ کە لە زۆر لایەنەوە پێش دەکەوێت لە داهێناندا دوایش مۆسیقا بە دوایدا دەچن و وەك گۆرانی و ئامێرەکانی مۆسیقاو ژمارەی سازدەران و گوێ گران، دوایش وێنەو پەیکەرتاشی و ئەدەب و پەخشان دەست پێدەکات، هەڵگرانی بیروباوەڕی راڤەی هونەری بۆ مێژوو بە گومان نین لە راستی ئەو راڤەیە لە لایەنی مێژوویی‌یەوە، گەر پەیوە ندیەکانی نێوان

دین و یاساو سیاسەت و ئابووری لێک بدەینەوە لە دیدی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە و دوای شیکردنەوەیان دەگەینە ئەوەی کە هونەری ئەو بنچینەیە کە دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی تر پشتی پێ دەبەستن، بەڵام هونەر بە هەموو شێوەکانیەوەو جیاوازیەکانیەوە هەمووی لەنێو ئەو کۆمەڵگایەدا لە یەک کاتدا گەشە ناکات بەڵکو بەشێوەی پلەیی گەشە دەکات وەک باسمان کرد.گەر دوای ماوەیەکی ناسراو گەشە بکات کاریگەری خۆی دەکات لە ڕەوتی مێژووی مۆڤایەتیدا لە پێشکەوتنی شارستانیەت لە هەموو لایەنێکەوە، هونەر وەک لەشی مرۆڤ وایە تووشی گۆڕان دەبێت کە بە منداڵی لەدایک دەبێت و دوایی گەشە دەکات و پیر دەبێت و دەمرێت.

# پێکهاتەی مێژوو

گەل بێ مێژوو نابێت، مەحاڵیشە مێژوو ببێتە مێژووی گەلێك کە نرخی مێژووەکەی نەزانێت و بایەخی پێنەدات، ئەو گەلانەی مێژوویان وەلاناوەو بایەخی پێنادەن بوونەتە مەهزەلەی مێژوو لە پەراوێزی مێژووەکاندا گیریان خواردووەو ناچنە نێو پەراوی پیرۆزی مێژووەوە، هەروەها مێژووش دەیانداتە بەر گورزی بێبەزەیی خۆی، چونکە مێژوو حاڵەتە حەتمیەکان وەك کارێکی میکانیکی بەرێوە دەبات بۆ هەمیشە گەشەکردنی ناوەڕۆك و ناوکی خۆی کە گەل و کۆمەڵگا بەشێکن لێی و درایش دەبنە دروست کەری مێژوو، مێژوو لەو ڕەوتە دینامیکی و حەتمیەی خۆی لانادات و لە قۆناغە جیاجیاکانی خۆیدا گەشەی تەواو دەکات و تێدەپەڕێ تا لەو ساتە ئاسکانەی خۆیدا مێژوو گەورەترین ڕۆڵی خۆی دەبینێ بۆ بەرەو پێشەوە چوونی ڕەوڕەوەی خۆیی و گەشە یاسایی‌یەکەی کۆمەڵگاو مرۆڤایەتی بە هوشیاریی‌یەوە لەگەڵ

هەنگاوەکانی مێژوودا هەنگاو نەنێ ئەوا دووچاری گری کوێرەی کۆمەڵایەتی و نامۆیی مێژوویی دەبێت و لە زەلکاوی بێهۆشی و گێلیدا دەمێنێتەوەو ئاگات بە گۆڕانکاریەکانی مێژوو، مێژووش لەو دیو لەدایک بوونیەوە بەجێی دێڵێ و بەڵام لە پەراوێزەکانیدا ئەو ڕووداوو ناهوشیاریی و پێک نەهاتەی کۆمەڵایەتی و هەروەها باری سیاسی و ئایدیۆلۆژی و کولتووریەی ئەو گەلانە تۆماردەکات کە بێ ئاگابوون لە ڕەوڕەوەی مێژوو، یان وانە گرنگەکانی مێژوو وەک حەتمیەتی دەرەکی و ناوەکی و پێویستی لە قۆناغەکانی مێژوودا، کەوابێ گوێ نەدانە مێژوو پاشەکشەکردنە بۆ نێو قوڕاوی سەرلێشێواوی گەلان و ناکامڵ بوونی کۆمەڵگایە لە هەموو ڕوویەکیەوە دواییش تێکشکاندنی پێکهاتەکانی یەکەکەی کۆمەڵگا کە دواجار دەبێتە کۆمەڵگایەکی ڕووخاو تەمەڵ و دواجار کەسێتی‌یەکی دارماو و داتەپیو ون بوو، لێرەشەوە بۆ دروست کردنەوەی مێژووی دوێنێ و ئەوەی لە دەست چوو پێویستی بە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی هەیە کە زۆر گران دەبێت لەسەر شانی کۆمەڵگاکە خۆی، کەواتە ڕێگەکرتن لەوەی مێژوو بۆ چەند جار خۆی دووبارە بکاتەوەو بگەینە مێژوویەکی ڕوون، دەبێ مێژوو بۆ جاری دووەم بخوێنرێتەوەو بنوسرێتەوەو لە هەمان کاتدا وانەی لێوە فێربین، دەنا نەتەوە، یان گەل یان کۆمەڵگا بێ مێژوو دەمێنێتەوەو دواجاریش لە هەموو ماکەکانی مێژوویی و کولتووری و نەتەوەیی و بوونی بە دەوڵەت

بێبەش دەبێت. واتە لەسەر هەموو تاکێکی کۆمەڵ پێویستە وەك پێویستی‌یەکی مێژوویی کە مێژووی گەلەکەی بخوێنێتەوە لێی بکۆڵێتەوە لە هەموو ڕوویەکەوە بەرەو پێشەوەی بەرێو لەزەلکاوی بێئاگایی رزگاری کات و پالێکی توندی پێوەبنێ بۆ بەگەڕخستنەوەی مێژووی نەتەوەکەی و لە هەمان کاتدا پاکی بکاتەوە لە دەستی بێگانەو هەروەها ڕۆشنایی بخاتە سەر لاپەڕە شاراوەو لێڵەکان و کە بوونەتە مێژوویەکی ڕەش و کرچ و کاڵ بە دەستی هەندێ مێژوونوسانی ناحەز کە ئەمەش گەورەترین ئەرکی مێژوویی مێژوونوسان و روناکبیران و دڵسۆزانی گەلە، گەر بیانەوێ ببنە خاوەنی مێژووی خۆیان، یان شانازی بکەن بە مێژووی گەلەکەیانەوە کە بە هۆیەوە سەرفرازی و شکۆمەندی بۆ خۆیان و بۆ گەلەکەیان پەیدا دەکەن لە هەموو فەرهەنگەکانی ژیانداو بە تایبەتی مێژوویی کە خۆی لە خۆیدا ئەرکێکی مرۆڤایەتی‌یە، نەك تەنها خزمەتی ئەو گەلە دەکات بەڵکو سەرجەم خزمەتی مێژووی مرۆڤایەتی دەکات، کە لە زۆر قۆناغدا تێکەڵی مێژوویی بەهۆی کارەسات و ڕووداوەکانەوە هەبووە، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو گەلان یەك مێژوویان هەیە، بەڵکو هەر گەل و نەتەوەیەك بە پێی بیروهۆش و ئاکاری تایبەتی مێژوویەکی تایبەتی خۆی هەیەو لێی جیانابێتەوە، کە دوایی لە هەست و نەست و کەسێتی‌دا بەدیار دەکەوێ، دیارە مێژوو گرنگی خۆی هەیە بۆ ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵ ئەمەش وای کردووە

که فەیلەسووف و زانایان بایەخێکی گرنگ بدەن بە مێژوو، هەروەها بە پێش مێژوو چونکە لەوێوە بەردی بناغەی پێکهاتەی مێشکی مرۆڤ دروست دەبێ و لەوێشەوە کە لە ڕووی سایکۆلۆژی و کولتووری و ئاکارییەوە دەڕوانرێتە کەسایەتی و ناوکەکانی مێژوو و ئال و گۆڕەکانی دەوروبەر، هەر بۆیە مێژوونوسان دووی دوێنێی مێژوو کەوتن و بە دوی مێژووی مێژوودا بکەون بە دووی مێژودا بگەڕێن و لە مردن رزگاری بکەن، کە ئەو پەیامە پیرۆزە بگەیەنن بە گەل و نەتەوەکان و دواجار یش بیکەنە زانست و پسپۆری بەدەست بهێنن لەو بوارەدا، دیارە مێژوو زۆر گرنگەو بایەخی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەو گەلانەی یا بۆ ئەو نەتەوانەی لە مێژوو نەگەیشتوون هەر لە بەرەبەیانی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتی مێژوو کەوتە بەرلێکۆڵینەوە بە تایبەتی دەوروبەرو شتە نهێنی و شاراوەکان و پیاچوونەوەدو خوێندنەوەی دوێنێی دەوروبەرو مرۆڤ وەك پێویستییەکی شارستانی و کولتووری و مرۆڤایەتی کە قۆناغێکی گرنگ بوو بە سەرانسەر مرۆڤایەتیدا تێپەڕ بوو کە قۆناغی پێش مێژوویان لێناو نابوو کە دوێنێ و مێژووی پێش مێژوو بووە پێك هاتەو دواجاریش وەك کەرەستەکانی مێژوو سەیر دەکراو بۆ بەیانی و دواڕۆژی مرۆڤایەتی بەکارهێنرا، ئەوەش دوای سەدە بەستەڵەکییەکان کە پێش نیو ملیۆن ساڵ دەبێت ڕوودا و بەهۆیانەوە واتە بەهۆی هۆکاری دۆخ و گۆڕانکاریە بایەلۆژیەکان و لە ساردییەوە بۆ گەرم و

هەروەها تواندنەوەی ئەو بەستەڵەکانە کە بە چەند سەدەیەکی تر واتە قۆناغێکی تر دوایش ڕوودانی گۆی زەوی بە هەندێ هۆکاری سروشتی بوونەتە تواندنەوەی چەرخە بەستەڵەکەکان و دەرکەوتنی هەندێ شارستانیەت و شوێنەوارە کۆنەکانی پێش مێژوو یان پێش دابڕانی مرۆڤ لە باری ئاژەڵێتی‌یەوە بۆ باری مرۆڤ کە بەهۆی گۆڕانی هەندێ دۆخی گەردوونی وەك، هەرەس هێنان، ڕوودانی لافاو، نمونە ڕووداوی (لافاوە جیهانی‌یەکە) کە (گەڕیۆفسکی) باسی لێوەدەکات و لە کتێبە بەنرخەکەیدا (نهێنی کۆنترین مێژو) دۆزراونەتەوە وەك ئەشکەوتەکان و چیاکان و نوسراوی سەردیواری ئەشکەوتەکان و لەوێشەوە بۆ دۆزینەوەی ئێسقانی مرۆڤەکانی پێشوو، یان ئەو مرۆڤانەی کە لە سەردەمی بەربەریدا دەژیان و کە بوونەتە ژێرخان و سەرخانی شارستانی‌یەتی و مرۆڤایەتی دوایش بە شارستانی‌کردنی ئەو شوێنەوارە کۆنانەو لە ئەنجامدا بە شارستانێتی کردنی بوونی ڕەگەز و ئاین و نەتەوە کۆتایی پێهاتووە، کە خۆی لە خۆیدا بناغەمایەکی کولتووری و ڕەسەنە لە هەمان کاتیشدا کەلەپورێکی مێژوویی سەرجەم مرۆڤایەتی‌یە لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، وەك دۆزینەوەی مرۆڤی (بەکین) کە لە ئەشکەوتەکانی (تشوکۆتین)ی (چین) دۆزرایەوە هەروەها ئێسقانی مرۆڤی (نیاندرتاڵ) لە شانیدەر ئەویش بە هۆی دۆزینەوەی پاشماوەکانی ژیانی ئەو مرۆڤانە لەو سەردەمەدا کە خۆی لە خۆیدا

چیرۆکی ژیانێکی کۆنمان بۆ دەگێڕێتەوە، یان دۆزینەوەی ئێسقانی مرۆڤ لە دۆڵی (کرومانیون) لە پاریس ساڵی ١٨٦٨، زۆر دۆزینەوەی دی کە دواتر کەوتنە ژێر باس و لێکۆڵینەوە بە تایبەت لە لایەن زانایانی ئارکۆلۆژی و ئەنسرۆبۆلۆجی و بایەلۆژی و سایکۆلۆژی‌یەکانەوە، دوایش گرنگیان دا بە پێش سەردەمی مرۆڤی ژیرو گەڕانەوەیان بۆ سەردەمەکانی پێش مێژوو کە لە ژێر باری نوسراوە کۆنەکانەوە دەگەڕانەوە بۆ سروشت و یاسا سەرەتایی‌یەکانی نێو کۆمەڵگەی بەربەرو خواوەندەکان و ئەفسانەکانی یۆنان و گریك و تەراژیدیەکان و گۆرانی‌یە میللی‌یەکان و هەروەها شیوەن و گریان و ڕێ و ڕەسمی ناشتن و مردن.. هتد کە ببوونە بەشێکی گرنگ لە مێژووی گەلان، کە هەر گەلێك بە پێی یاساو داب و نەریت و بیروهۆشی و ئەفسانەیی و ئایینی و تەراژیدیی خۆی بیری دەکردەوە، زاناکان بەپێی بیرە فەلسەفیەکان ڕۆشنایی‌یان دەخستەسەر ژیانی شاراوەی دوێنێی مرۆڤ و ئەسپی شارستانی و شکۆمەندی خۆیان تاو دەداو بەناوی دوێنێی مێژووی نەتەوەکەی خۆی لاف و گەزافی لێ‌دەدا، زاناکان مێژوویان بە چوار خولدا پێناسە کرد لە هەمان کاتیشدا بیری مرۆڤایەتی‌یان بە سێ قۆناغی سەرەکیدا پێناسە کرد کە مرۆڤایەتی پێی تێ‌پەڕی.

# خولەکانی مێژوو:

١-خولی یەکەم: کە پێش مێژوو بوو کە هیچ شتێ نەبوو واتە هیچ پەراوێك نەبوو کە مرۆڤ دوێنێ کۆمەڵەکەی خۆی تیادا نووسیبێ بۆیەش پێیان دەوت خولی (پێش مێژوو).

٢-خولی دووەم: لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە مەدەنیاتی کۆن دەستی پێکردو خەڵکەکانیان ئەمر دەکرد بە شێوەی هەڵکۆڵین یان وێنە یان بە نوسین و لە ساڵی (٤٩٥) دوای زاین کۆتایی دێت و ئەم خولەیان ناونا (مێژووی کۆن).

٣-خولی سێهەم: لە ساڵی (٤٩٥) دەست پێدەکات تا ساڵی (١٤٩٣) و ناویان لێنا (سەدە ناوەنجیەکان).

٤-خولی چوارەم: لە ساڵی (١٤٩٣) زاینی دەست پێدەکات تا ئەم سەدەیە کە پێی دەڵێن (مێژووی نوێ).

قۆناغەکان ، بیری مرۆڤایەتی کە ئەمیش بە سێ قۆناغی سەرەکیدا تێدەپەڕێ :

١-قۆناغی لاهوتی: ڕووداوەکان دەگەڕێنەوە بۆ هێزێکی دەرەکی، کە بیرێکی سەرەتایی بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانیەتدا لەدایك بوو.

٢-قۆناغی میتافیزیکی: هۆکانی ڕووداوەکانی ڕوون دەکردەوە لە شتەکانی دەوروبەردا کە دواجار خۆی دووبارە کردەوە لە بزوتنەوەی ریفۆرمیسنی دینی و بزوتنەوەی تەنویری لە ئەوروپا کە بە گرنترین قۆناغی لێکۆڵینەوە دەژمێردرێن و لێرەدا لیکۆڵینەوە مێژوویی‌یەکان سەری هەڵدا.

٣-قۆناغی وضعی: لێرەدا مێشکی مرۆڤ شتەکانی بە هۆکارە بابەتی‌یەکان دەخوێندەوە کە زۆر ئاڵۆز بوو.

سەدەی نارنجی یان ناوەڕاست گەورەترین قەڵەمباز بوو بۆ لێکۆڵینەوەی دوێنێی مرۆڤ و پاشەڕۆژی بە ئاگاهاتنەوەی لە دەوروبەر کە سەردەمی هۆ دۆزی و هەوڵدانێك بوو بۆ لێکدانەوەی شتەکان بەڵام شێوازێکی زانستیانەی تیادا نەبوو بەڵام کەمێك بەرەو پێشەوەچوونی بەخۆیەوە دی بۆ نێو زانست کە دواجار بووە هێزێکی کاریگەر بۆ دروست کردنی بنەماکانی فەلسەفە لە ڕێی شیکردنەوەی شتەکانی دەوروبەر بە بیرێکی سەرەتایی فەلسەفیانەوە لێرەشەوە خول سێ‌هەمی مێژوو دەستی پێکردو کە بە دووی خولەکانی پێشووی خۆیدا واتە پێشووی مێژوودا

دەگەڕاو زیندووی دەکردەوە لە هەموو ڕوویەکی یەوە بۆ پاشەڕۆژێکی ڕوون و ئاشکراو پوختە زۆرجار فەیلەسووفان و زانایان و ڕابەرانی ئەو بیرۆکەیە چوارچێوەیەکی خەیاڵی دەگرتەبەر، وەك مارکس دەڵێ (دابەش بوونی بیرۆکەی مرۆڤایەتی بەدوو قۆناغدا تێپەڕ دەکات کە ئەویش:

١-قۆناغی یۆتۆپیا، کە دوو قۆناغ پێك دەهێنێ:

أ-لاهوتی.

ب-میتافیزیکی

ئەمەش ئەو قۆناغەیە کە درێژە پێدەری بیری مرۆڤ لەو ساتەوە کە هاتەوە سەرخۆو بیری کردەوە تا سەرهەڵدانی فەلسەفەی مارکسیەت بە بیرو باوەڕە زانستی و مادی و جەدەلیەکەی کە مارکس ئە قۆناغی (لاهۆتی و میتافیزیکی)یە بە قۆناغی ون بوون و پارچە پارچەو نامۆیی لە قەڵەم دەدات.

٢-قۆناغی زانستی: ئەو قۆناغە بوو کە لەگەڵ لە دایك بوونی فەلسەفەی مارکسیەتدا لە دایك بوو دوای زەمەنێکی ون بوون و لێك داپچڕان و نامۆیی هەروەك مارکس وتی: پێك هاتەکانی مێژوو هەر لەوانە خۆیان نابینن بەڵکو ناکۆکی یەکانیش ڕۆڵێکی سەرەکی گرنگی پێك هاتەو کەرەستە ی مێژوویی ین وەك ناکۆکی یە دینەکان و هەروەها شە و شۆڕو داگیرکردن هەروەك چۆن مارکس دەڵێ "زەبرو زەنگ مامانی مێژوە" یان دەڵێ "مێژوو بێجگە لە ململانێی چینایەتی هیچی تر نییە" دیارە

سەردەمی زێڕین یان ڕێنیسانس ڕێ خۆشکەرێك بوو بۆ ئەو ناکۆکیانەو زەمینەیەکی دروست کرن بۆ پێك هاتەکانی فەرهەنگەکانی دیکە وەك بیری نەتەوەیی و مەسەلەی ئابووری کە هۆکارێکی گەورە بوون بۆ سەرهەڵدانی گەلێ جەنگ، لەوێشەوە بۆ زیندووکردنەوەی دوێنێ و رزگارکردنی مێژوو لە مردنی، زۆر پێویستە لێرەدا کەمێ لەو سەردەمە باس کەین چونکە بەشێکن و لایەرەیەکن لە پێك هاتەکانی مێژوو، گۆڕانکاریەك بوو بەسەر ژیانی خەڵکەوە هات چ لە ڕووی ئابووری و چ لە ڕووی فەلسەفەو چ لە ڕووی زانستەوە.

## ناکۆکییەکانی سەردەمی زێڕین:

دیارە ڕینیسانس لە ئەنجامی حەتمی کۆمەڵێك هۆی ناوخۆیی و دەرەکیدا هاتە کایەوەو پێکەوە لە مندالدانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئەورووپادا کاری خۆیان کرد کەواتە ڕێنیسانس بە حوکمی ئەو واقیعەی تێیدا لەدایك بوو چ لە شێوەی تێڕوانیندا بۆ دیاردەکانی ژیان و چ لە بیرکردنەوەدا ڕێبازێکی نوێی گرتەبەر، تەواو پێچەوانەوەی بیروڕای باوی کۆمەڵی کۆن و پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانەوە بوو، چونکە ئەر ڕۆژگاری بوژانەوەدا ئەو پەیوەندییە کۆنانە لە لایەك بوو بوونە بار بە سەرشانی کۆمەلانی خەلکییەوە لە لایەکی تریشەوە تەعبیریان لە سیستەمی کلێسەی کاتۆلیکی و مەلس و کەوتی دوگماتییانەی دەکردو کۆسپێکی گەورەشیان لە بەردەم داهێنان و بیری نوێی پەرەسەندوودا دانابوو، زانایان لەم بارودۆخە تازەیەدا کەوتنە .خۆو شێوازی نوێی جۆربەجۆریان دەدۆزییەوە تا بە هۆیانەوە بەربەرەکانێی سیستەمی

کۆن و بیروباوەڕی باوی دەرەبەگایەتی پێبکەن و پەردەیان لەسەر هەڵبماڵن ـ ریشەکێشیان بکەن، بۆ ئەم مەبەستە زۆر ڕێگایان گرتەبەر کە یەك لەو ڕێگایانە مێژوو بوو وەك ئامرازێك بەکارهێنرا دژی بیری کۆن، بە تایبەتی دژی پیاوانی ئاینی و سیستەمی دەرەبەگایەتی.

جەنگی ناکۆکی دینی نێوان کاتۆلیك و پروتستانت کە هەریەکەیان بە جۆرێك خۆی دەبرد بەڕێوەو لە بەرگێکی دژ بەیەکدا کە پرۆتستانیەت نەتەوەیی یانە بیری دەکردەوەو کاتۆلیکیش نێو نەتەوەییانە بیری دەکردەوە. بەڵام هەرە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو جەنگ و ناکۆکییانە ڕێبازی ئابووری بوو ئەم ڕووداوانە بەهۆی ناکۆکی نێوان بیروباوەڕی کەنیسەکان و دەرەبەگەکان هەڵچوو کە هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوویەرێکی ئابووری بەهۆی داگیرکردنی ناوچەیی و دەسەڵات لەژێر کاریگەرێتی دەمامکە جیاکانی قۆناغەکانی کۆمەڵگای بە تایبەتی دین شەڕی خاچ پەرستەکان یان (خاچەکان) هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ بڵاوبونەوەی هەستی نەتەوەیی لەنێو گەلاندا کە بە هۆی پەرش و بڵاوبوونەوەیان بەنێو گەلاندا کە بە زمانێك دەدوا، لێرەوە هەر نەتەوەیەك شانازی بە پاڵەوانەکانی جەنگەوە دەکردو وەك ئەفسانە باسی لێوەدەکردو ئەمریان دەکردن، شانازیان بە سەرکەوتنەکانەوە دەکرد لە جەنگدا، زۆرجار دین هاندەرێك بوو بۆ جەنگ یان چەکێك بوو بۆ دژی دوژمن بەکاردەهێنرا، بە تایبەتی شەڕو پێك دادانی ئینگلیزی و

فەرەنسی و ئەڵمانی لە شەڕی خاچ پەرستەکاندا دین بوره داردەست یان دین کرا بە ئامرازێکی نەتەوەیی و نیشتمانی کە هەندێ لە جەنگەکان بە جەنگی نەتەوەیی‌یانەوە کۆتاییان پێهات بە تایبەتی جەنگی نێوان ئینگلیزو فەرەنسا کە جەنگی سەد ساڵەی پێدەڵێن، لێرەدا پاشاکان رەمزی یەکێتی‌و نەتەوەیی و سەربەخۆیی بوو، کە هەموو شتێ بوو شەڕی دیاری دەکردو شەڕی راوەستاند، هەروەها جەنگی سی ساڵە کە دوا جەنگی دینی بوو لە ئەورووپادا کە جەنگێک بو هۆکارەکەی ئابووری بوو کەبووە هەڵساندنی ئەو جەنگە، هەروەها پاشەکشەی خاچ پەرستەکان و شکستیان زۆر دیاردەی شارستانیەتی لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا پەراندەوەو بەر لە هەموو شتێك لە بوژاندنەوەی ئەورووپادا رەنگیان دایەوە رەگەزەکانی کولتووری رۆژهەڵات لە سەرو هەموویانەوە کولتووری عەرەبی ئیسلامی هەر زوو لە بیروباوەڕی رێنیسانسدا کاری خۆیان کردو دوایش لە دەستکەوتەکانیدا خۆیان نواند، کاریگەرێتی خۆی کردە سەر زۆر فەلسەفەی ئەورووپا یەکێك لەو فەیلەسووفانە (توینبی) بوو کە لە نوسینەکانیدا بیری دینی ئیسلامی تیادا دەرببوو.

دین کرایە ئامرازێك بۆ جەنگ و لە خزمەت جەنگدا کاری پێدەکرا لە پێناو دەستەبەرکردنی سەرکەوتنی جارێك نەتەوەیی و جارێك ئێسەیی و هەروەها ناکۆکی‌یە ئایینی‌یەکان وای کرد کە دەرفەت بۆ پەیدابوونی وڵاتانی نەتەوەیی نوێ دروست بکات یا بیخولقێنێ دەرەبەگایەتی وەك

جێ گرەوەیەك هات و گشت روخسارە كۆنەپەرستەكانی لە خۆگرت و خستی‌یە خزمەت خۆیەوەو بڕیاری بەسەرهاتەكانی مێژوو كەوتە پشت ئاسمانەوەو لەویێوە بڕیار دەدرا، مێژونوسان لەگەڵ ئەو ڕژێمە بۆگەنەو ئەو كڵێسەیەدا دانویان نەدەكوڵا بۆیە كەوتنە رەخنەو لێكۆڵینەوە كە توێژاڵی خەیاڵی لە بەردابوو، زاناكان مێژوویان كردە چەكێكی بەهێز بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕژێمە كە كلكایەتی نیمچە دەوڵەتی لاهوتی بوو ویستیان لە ڕێگەی مێژووەوە خەڵكی وریا بكەنەوەو دواجاریش كۆتایی‌یان بە قۆرخ كردنی مێژوو لە لایەن كڵێسەوە هێنا، پیاوانی كڵێسەو دەرەبەگەكان دەیانویست تاكەكەس و پەرتووكە پیرۆزەكان بكەن بە سەرچاوەی هەموو شتێك و بێ لەو بەدەر هیچ شتێك نی‌یە نوسراوەكانی نێو پەڕاوەكان دەچن بەڕێوە كە نیشانەی بەدین كردنی دەوڵەتی پێشوی پێوە دار بوو كە گەورەترین كێشە بوو لە سەردەمی پێش ڕینیسانسداو لە بەرەبەیانی ڕێنیسانسدا تا بە زانست بوونی بیروباوەڕەكان كۆتایی‌یان پێهات مێژووش بەرگی مێژوویی خۆی لەبەركرد وەك زانستەكانی ترو وەك مێژووی نوێ هاتە دنیاوە یان سەری هەڵدا، مێژوو هەنگاوی گەورەی بەخۆیەوە بینی و گەورەترین ئەركی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆی بەجێگەیاند كە سەرهەڵدانی ئەو دوو چەمكە (نەتەوەیی و نیشتمانی) بووە هۆی وریا بوونەوەی سەرجەم مرۆڤایەتی، وەنەبێ باوەڕی ئایینی ڕۆڵی نەبووبێ لە ڕەوتی كۆمەڵگادا

هەیبووە لە بارو زروفی خۆیاندا کاری گەورەیان کردۆتە سەر کۆمەڵ و دەوری خۆیان بینیوە، دەرەبەگی دەسەلاتدار لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیدا هەندێ تەنازولی بۆ چینی هەژار کرد چونکە ڕۆڵێکی گرنگیان لە بەرهەم هێناندا دەگێڕا ئەم بوویەرە وای لێکرد کە هەست بکات کە پێویستی بە ئایدۆلۆژیایەك هەیە کە بەرژەوەندی‌یەکانی پێ بپارێزێت لەو قۆناغەدا ئاینی مەسیحی توانی ئەم ئەرکە بەجێبهێنێ و لێرەدا کڵێسە بووە پاڵپشتی بەهێزی سیستەمی دەرەبەگایەتی، بەو جۆرە دەرەبەگایەتی رەگی خۆی داکوتی ، هەموو ژیانی گرتەوە، پیاوانی ئایینیش تا دەهات سیمای ئایینی دەبەخشی بە بوارەکانی ژیان و ئەدەب و هونەرو فەلسەفەو دەیان خستنە ژێر رکێف و تەوری یاسا ئایینی‌یەکانەوە کە زۆرجار لەنێو دەمامکێکی نەرمدا خۆی پیشان دەدا، بەمەش ئایدۆلۆژیای کڵێسە تەنگی بە خەڵکی هەڵچنی بوو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ڕەنگی دایەوە تاوای لێهات مەسیحیەت بووە دینی دەوڵەت و زیاتر دەمارگیری دەگرت لەم بۆچوون و یەك گرتنەوەدا هەندێ بزوتنەوەی عەقڵانی و سروشتی دروست بوو کە خێری بۆ تاکەکەس و کۆمەڵ ببێت لەوانە هۆمانیستەکان (الانسانیون) کە بە (مرۆڤایەتی) ناویان دەنان و رابەرانی ئەم رێبازی نوێیە مەبەستیان هەڵبژاردنی ئەم زاراوەیە ئەوەبوو پێ لەسەر سیما دونیایی‌یەکەی زانست و ئەدەب دابگرن و بایەخ بە ئادەمیزاد بدەن، لێرەوە گورزێکی کوشندەی خەیاڵی

گەیاندرایە لاهوتی‌یەکان کە مرۆڤیان مل کەچ و کۆت کردبوو کە هەموو شتێکیان دەبەست بە ئاسمانەوەو پیاوانی کلێسەو چڵکاوخۆرەکان لە ژێر ئەو پەردەیەدا خواستەکانی خۆیان جێبەجێ‌بکەن.
هۆمانیستەکان پێ لەسەر خودی ئادەمیزادو کەسایەتی تاکەکەس دادەگرن و دوریش بوون لە جەوهەر ئایینی مەسیحی‌یەوەو وەك شۆڕشێك سەری هەڵدا دژی یاسای ئارەوای کلێسە، ئەم پێشکەوتن و بیروباوەڕانە هاتنە ئاراوەو کاکڵەی ئایدۆلۆژیای چینی بۆرژوازیان پێك دەهێنا کە دژ بە دەرەبەگ بوو، زاناکان بایەخێکی تایبەتی‌یان دا بە پەرتووکە ئاینی‌یەکان و زۆر لایەنی شاراوەو گرنگیان بۆ کۆمەڵانی خەڵکی روون کردەوە (لۆرینزۆ ڤالا) دەیوت بە هیچ کلۆجێ پاپاکان مافی ئەوەیان نیی چ لە (فاتیکان) و (رۆما) و چ لەهەر بستێکی تری سەر رووی زەمیدا دەسەلاتی سیاسی‌یان هەبێ و بێ سڵەمینەوە دەیوت (ئەوانە لە قەشەوە بوون بە جەردەو گورگ و دەمیان ژنیوەتە رەنجی خەڵکی) رۆژگاریی ریێنیسانس بووە هۆی هەڵتەکاندنی رژێمی دەرەبەگایەتی و دروست کردنی بوارە زانستی‌یەکان و رزگارکردنی مێشك و رۆحی مرۆڤ لە شتە پڕوپووچەکان، بۆرژوازی تازی پێگەیشتوو پەردەیان لەسەر ژیانی رەبەن و قەشەو تێکڕای پیاوانی کلێسە هەڵدەماڵی و ئاشکرایان کرد کە ئەو پیاوانە کە کۆمەڵە خەڵکێکی مشەخۆرو ئنتەلا کردوو ساختە بازوو داوێن پیس و دوو زمان و مەرایی

کەرن و تا چ ڕادەیەك لە ئایینی مەسیحی لایان داوە تا چ ڕادەیەك خەڵکیان هەڵخەڵەتاندووەو خەڵکیان دوورخستۆتەوە لە ڕاستی‌یەکان، لەم بارەیەوە پیاوانی کڵێسە زیاتر دژی ئەوانە بوون کە دەبوونە ڕێگر لەو سەردەمەدا تەنانەت زۆرجار زانایان دەسوتاند بێ دادگایی کردنیان یان هەموو تەمەنیان لە زیندانەکاندا دەبردە سەر وەك (برۆنۆ) کە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٦٠٠ گۆڕەپانی شاری (ڕۆما)دا بە پێشچاوی خەڵکەوە ئاگری تێبەردرا (برۆنۆ) لەکاتی لێپرسینەوەدا بەوپەڕی شانازی‌یەو بەرگری لە بیروڕاکانی خۆی کرد تەنانەت لەو کاتەدا کە بڕیاری سووتاندنیان دا بە گاڵتە پێکردنەوە بە دادگای وت (وا بزانم ئێوە زۆر لە من زیاتر لەو بڕیارە دەترسن) هەروەها لەو زاناو فەیلەسووفانە کەوتنە بەر شاڵاوی ئەشکەنجەو دورخستنەوە، زانایان کۆڵیان نەدەداو لە شیعرو چیرۆك و داستان و تەراژیدیاو کۆمیدیاو هونەرەکانیان شاکارەکانی خۆیان دەنواند دژی دەرەبەگ و پیاوانی ئایینی کڵێسە بە تایبەتی بڵاوکردنەوەی زمانی نەتەوەیی و هەستی نیشتمانی کە ببوە سەرەکی ململانێی ئەو ڕۆژگارە لە نێوان پیاوانی کڵێسەو زاناکان هەروەها ژیانەوەی کولتووری کۆن و نووسینەوەی مێژوو بە شێوەیەك کە ژیانی مێژووی کۆن، زیندووکەنەوە لە هەمان کاتدا وەك ئامرازێك بەکاربهێنن، لەو سەردەمە ئاڵۆزەدا زۆر بیری تر سەری هەڵدا وەك سۆشیال ئایدیالیستەکان کە داواکاری سیستەمێکی

یەکسانی و بەختیاری دەخواست بۆ کۆمەڵ ئەویش لە خەیاڵ زیاتر تێنەدەپەڕی، هەندێ زاناو فەیلەسووف تەنانەت کۆماری خەیاڵییان دروست دەکرد، کە یەکسانی و بەختیاری و خەویان بە ڕژێمێکەوە دەبینی کە تێیدا زانایان جڵەو بگرنە دەست وەك کۆمارەکەی ئەفلاتوون یان (یۆتۆپیا) کەی (تۆماس مۆر) بەڵام ئەو بیرو باوەڕانە لەو ڕۆژگارانەدا لە چوارچێوە تەسکەکەی خۆیدا گیری خواردو نەیتوانی ڕۆڵی خۆی بینێ، هەستی نەتەوەیی پاڵی بە مێژوو نووسانەوە نا کە چارەسەر بە کردەوەو بۆ کێشە کۆمەڵایەتیەکان بدۆزنەوەو هۆی ڕاستەقینەی کارەساتە مێژووییەکان دەست نیشان بکەن ئەنجامیش دەگەڕان بە دوای ئەو تاکە کەسە هۆشیارانەدا کە ڕۆڵێکی دیاری لە ڕەوتی بەرەو پێشەوەبردنی بەسەرهاتەکاندا گێڕا، هەروەها لە ڕوانگەی نوێوە دەیان ڕوانییە کارەساتەکانی مێژوو یان کارەساتە مێژووییەکان و ڕۆڵی تاکەکەسیان تێدا دیاری دەکرد هەروەك بەپێی بیروباوەڕی (گویجاردینی) خۆپەرستی یان خۆپەرست تاکەکەس دروست دەکات و نووسەران و کەڵەپیاوانی مێژوو بە تایبەتی بۆرژواکان پاڵێکی بەهێز و گەورەیان نا بە ڕەوڕەوەی مێژووەوەو دابڕینی مێژوو لە کڵێسە وەك کەڵە نووسەری ڕۆژگاری ڕێنیسانس (ماکیاڤیللی) کە بە یەکێك لە گەورەترین دەستکەوتی لێکۆڵینەوەی مێژووی نوێ لە قەڵەم دەدرێ، ئەمیش سەرەڕای ئەوەی دژی کڵێسەو ڕژێمی دەرەبەگ بوو بەڵام ئایینی دەکردە

ئامرازێك بۆ خزمەتكردنی سیاسەت، كە لە ژێر تیۆری‌یەكەیدا چەقی دادەدا كە دەیووت (ئامراز ئامانج پێك دەهێنێ) واتە بۆ بەرقەراركردنی هەر مەبەستێك دەشێ هەموو جۆرە ڕێگایەكی بۆ بیگرێ، وەنەبێ كە دژی بیرەكانی (میكیاڤیللیەت) نەبووبن كەسان هەبوون زۆر بە توندی دژی بیروڕاكـــانی دەجوولانــــەوە بـــە تایبـــەتی نازیـــەكان و سۆسیۆلۆجیستەكانی فاشیزم بەلام سەرەڕای ئەوەش میكیاڤیللیەت قەڵەمبازێكی گەورەی‌دا بە قۆناغەكەی خۆی، لەژێر دەستی زاناو چینی بۆرژوازیـدا مێـژوو رزگـاری بـو لـە دەسـتی كڵێسـەو سیسـتەمی دەرەبەگایەتی و هەندێ ڕێبازی نوێ هاتە سەر شانۆ، وەك (سان سیمۆن) و (شارل نۆرییە) و (رۆبەرت ئۆیین) كە گەلیان كردە هەوێنی ڕووداوی مێژوویی و خەباتی چینایەتی‌یان تێكەڵ بە مێژوو كردو فەیلەسووفی ئەڵمانی (هیگڵ) هاتە نێو شانۆی مێژوو كە یەكەم كەس بوو هەوڵی داوە ئاڵ و گۆڕە ناوخۆكانی مێـژوو دەستنیشـان بكات گوایە پێشخستنی مێژوو هەر لە قۆناغ و سەردەمێكدا یەكێك لە گەلانی جیهان ئەركی ئەو پێشخستنەی دەكەوێتە ئەستۆ، دوای ئەوەش ماركس هاتە سەر شانۆی مێژوو كە بە هۆی خەباتی چینایەتی و بەرهەمهێنان و ئابووریـەوە لـە مەسەلە مێژوویی‌یەكانی دەكۆڵیە وەو لەوێوە بڕیاری دەداو ئەنگلس بە هەمان شێوەی ماركس خەباتی چینایەتی دەكردە بڕبڕەی ئاڵ و گۆڕی ڕووداوی مێژوویی ئەنجامیش وەچەرخانی باری ئابووری و دەسەلاتی

سیاسی . ، له چینیکی پاشکەوتووەوە دەچێتە چینێکی پێشکەوتوتر، کە یبلی ـانۆف زیـاتر لـە مێـژووی کۆلّیـەوەو خسـتیە بـەر تیشـکی جەدەلیە . و بەرگێکی نوێی کردە بەر مێژوو و مێژووی کردە بەشێك لە زانســـتە ـان پێکهاتەیـــەکی بـــۆ دارشـــت لـــە رێگـــای لێکۆڵینـــەوە فەلسەفی ـەکانی‌یەوە. ئا لەم بۆچوونەوە مێژوو بوە زانستی زانستەکان و وەك هەموو زانستەکان مێژووی تایبەتی خۆی هەیە لەگەڵ پـەیدابوونی ئادەمیزاد دەست پێدەکات بە هۆی کەرەستەکانی پێش مێژوو درێژە دەکێشێ بۆیەکا مێژووی مێژوو لە مێژووی گشت زانستەکانی تر دوورو درێژترەو بایەخێکی تایبەتی پێدەدرێ و چونکە ئەو گەلەی مێـژووی نەبی خاوەن هیچ شتێ نابی هەروەها ئەو گەلەی لە مێژوی ئەگا هەمیشە مێـژوو ـی دووبـارە دەبێتـەوەو مێـژووش بێبەزییانـە دەیانکاتـە گاڵتەجاڕی مێژوو، واتە دەبێ بایەخ بە رابردووی کۆن و دوێنێ بدەین وە ك مێژوویەك سەیری بکەین و لەژێر تیشکی زانستیانە لێیان بکۆڵینەوەو بینوسینەوە بۆ دوێنێ و ئەمڕۆو بەیانی گەلەکـەمان، هـەروەك (هیگـڵ) دەڵێ: (فلان شوێن کە مێژووی خۆی نەنوسیوەتەوە، نەبووەتە خاوەنی مێژووی خۆی).

سەرچاوەکان:


١-رێنیسانس. د. کەمال مەزهەر. فوئاد مەجید میسری کردوویەتی بە کوردی. بەغداد ١٩٨٤.

٢-تاريخ اوروبا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية ١٥٠٠-١٧٨٩. د. محمد محمد صالح بغداد ١٩٨٢.
٣-المدخل الى الفلسفة، صدام الزيادی- الجزء الاول ١٩٨٩.
٤-نهێنی کۆنترین مێژوو گەربۆفسکی جەلال تەقی لە ڕوسەیوە کردویە بە کوردی ١٩٨٠.

## ڕۆڵی تاکەکەس لە مێژوودا

لە مێژوودا سەرکردە (وەك تاکە کەسێك) گەورەترین ڕۆڵ دەبینێ، ناتوانرێ بێ سەرکردەیەکی هوشیار بیر لە کۆمەڵگایەکی هوشیاری مرۆڤایەتی بکرێتەوە چونکە دەبێتە داینەمۆ بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا لە بارێکەوە بۆ بارێکی ترو ژیانی نوێی پێ دەبەخشێ و بەرەو پێشکەوتنی دەبات و پاڵ بە ڕەوڕەوەی مێژووەوە دەدات، دیارە ڕەوتە مێژوویی‌یەکان پێویستی‌یان بە سەرکردەیەکی هوشیار هەیە بیبات بەڕێوەو لە تەکیاندا کۆمەڵگاش بەرەو پێشەوە بەرێت و ڕێگایان پیشان

بدات، زۆر كات كومـەڵگا ڕووبـەڕووی هـەرەس و بـەرەو دواوە چـوون و چەقین دەبێتـەوە بۆ ئـەوەی كۆمەڵگا لـەو هەرلومـەرج و ساتە ناسـكەی قۆناغـە مێژوویی‌یەدا ڕزگار بكرێت، دیارە ئـەو قۆناغـە وەك حەتمیـەتی مێژوویی پێویستی بە پاڵنێك دەبێت بۆ پێشەوە بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانە ئەویش لە ڕێی كەسێكی هوشیارەوە یان سەركردەیەكی بلیمەتـەوە ئـەو ئەركە گرنگـە جێبـەجێ دەكـرێ و كۆمـەڵگا ڕزگـار دەكـات لـەو قۆناغـە ناسـكەی ئـا لـێرەوە كۆمـەڵگا وەك ڕەوتێكـی دینـامیكی دوا بـە دوای هـەنگاوەكانی ئـەو سـەركردەیە دەڕوات بـەرێوەو سـەركردەش لێزانانـە جڵەوی مەسەلەكە بەلای خۆیدا ڕادەكێشێ و كۆمەڵگا ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشـەوە دەبـات، واتـە كاتـێ كۆمـەڵگا لـە قۆناغـەكانی پێشـوو (یـان كۆیلایەتی یان لە ژێر باری گرانی سیستەمی فیودالدا چەقی بێت) ئا لەو ساتانەدا سەركردەی لێهاتوو وەك ڕەوتی مێژوو/ وەك یاسای سروشتی پێشكەوتن و كەسێتی‌یەكی بـەهێز دەردەكـەوێ و خـۆی دەسـەپێنێ و دەبێتـە پێویسـتی‌یەكی مێژوویـی بـۆ گـەڕدانی ڕەوڕەوەی مێـژوو بـۆ پێشەوە، ئەو سـەركردانە دەگمـەنن لـە مێـژوودا كـە چـۆن مێـژو بـەلای خۆیاندا وەردەچـەرخێنن و كـاری ڕابەرایـەتی دەگرنـە دەسـت و لەگـەڵ گەلدا یەك دەگرن بۆ گەشە پێكردنی یاساكانی گۆڕانـی كۆمەڵ، كاتـێ كۆمـەڵگا پێویسـتی بـە گـۆڕان هـەبێت و لـە قـەیرانێكی دژواردا بـژی و پرۆچێسە ژیانیەكان خەریكن بەرەو مردن دەچن ئەو كاتەش سـەركردەی

لەبارو لۆھاتوو سەرھەڵدەدات و کۆمەڵ بەو شێوەیەی .خۆی ڕەوتی پێشکەوتن بخوازێ لەوێوە ژیانی نوێ و سەرکردەی نوێ جڵەوی کۆمەڵگا دەگرێتە دەست و دەبێتە (ڕێنیشاندەرو ھاندەر) بۆ پێش کەوتنەکانی کۆمەڵگا کە خۆی واتە کۆمەڵگا خاوەنی ھەموو سەرچاوەکانەو خۆشی خاوەنی مێژووە، واتە سەرکردەش کاردەکاتە سەر ڕووداوە مێژوویی‌یەکان و چەند لە قۆناغی مێژوویی و ئەرکەکانی تێ بگات ھێندە زۆرتر سەرکەوتوو دەبێت، بەلام نابێتە خاوەنی مێژوو، یان دروست کەری مێژوو، بەلام جێ دەستی دیار دەبێ لە ڕووداوە مێژوویی‌یەکاندا، واتە "ڕەوڕەوەی مێژوو یەکجار گەورەیە، بەرەو پێش بردنی ھەرگیز لە وێزەی تاکە کەسدا نەبوەو نی‌یە، بێ‌گومان خاودنی مێژوو گەلە"، ڕەوڕەوەی مێژوو ھەمیشە بەرەو پێشەوە دەڕوات لەوانەیە بۆ ماوەیەك بوەستێت بەلام ھەرگیز بەرەو پاش ناگەڕێتەوە "ھیگل لەوەش گەیشت کەکەس نی‌یە بتوانێت ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەو پاش بکێڕێنتەوە"، لێرەدا ھەلومەرجی بابەتی و ژانی کۆمەلایەتی و پەنگ خواردنەوەو بەستەڵەکی ئایدلۆژی کۆن و بیروباوەڕی کۆنەپەرستی و کەسێتی تاکەکەسی دواکەوتوو وا دەکات و وای دەردەخات کە زەمینەو ھەل و مەرج ڕێك دەخات یان ڕێك دەخرێت بۆ سەرکردە واتە پێداویستی مێژوویی سەرکردەی مەزن دروست دەکات وا نەبوایە دەوروبەری دوو ھەزارو پەنجا ساڵ لەمەوبەر بەدەیان ھەزار کۆیلەی ڕۆمانی دوای

سپارتاک س نەدەکەوتن، بۆنی ئازادی بۆ زۆربەیانی لەوپەڕی وڵاتەوە ڕاکێشایە ناو کۆڕی خەباتەوە بەر لەوەی ناوی سپارتاکۆس بەر پەردەی گوێیان ب ەوێت، یان فشاری کەم وێنەی دەرەبەگەکانی ئەڵەمانیا سەدان هەزار ج تیاری ناچارکرد ساڵی ١٥٢٤-١٥٢٥ پەلاماری چەك بدەن بێ ئەوەی یەك سەرکردەیان هەبێت، سەرەڕای ڕۆڵی تاکە کەس لە کۆمەڵگاداو لە مێژوودا کەچی نەدەبێتە دروس کەر وە نە خاوەنی مێژوو، چونکە تاکەکەس بێ کۆمەڵ هیچ بایەخێکی نییەو ناتوانێت بێ کۆمەڵ و دەوروبەر گۆڕانکاری دروست بکات، زۆرجار بەهۆی هەندێ بیروباوەڕەوە دەستەو تاقمێك ویستویانە جڵەوی مێژوو بدەنە دەست سەرکردەکان و سەرکردەکان بکەنە دروست کەری مێژوو، بەمەش ڕەوڕەوەی مێژوو بەپێی پێویستی و بەرژەوەندیەکانیان ڕابگرن و بەهۆیەوە خۆیانی پێ بپارێزن، بەڵام ئەم هەوڵانە هەموو پووچەڵ بوونەتەوە لە بەردەم ڕەوتی هوشیاری گەل و هەروەها وانەکانی مێژوودا، هەندێك لە سەرکردەکان ویستیان گاڵتە بە مێژوو کۆمەڵگایە چونکە خۆیان دروست کەری مێژوون هەروەك مارکس دەڵێ "خەڵکی بۆ خۆیان مێژووی خۆیان دروست دەکەن بەڵام نەك بە ئارەزووی خۆیان، ئەوان لە زروفێکدا دروستی ناکەن کە خۆیان هەڵیان بژاردووە، بەڵکو لە زروفێکدا دەستەو یەخە دەبن کە ڕابردوو بۆی هێناون و پێی بەخشیون" بەڵام سەرکردەش ڕۆڵی کاریگەرو دینامیکی بیرو هۆش و

ناراستەکەر دەبینی تیایداو جێی خۆی دەکاتەوەو لەنێو کۆمەڵگادا کە دواجار گەشەی پێ دەکات و ژیانی بە بەردا دەکاتەوە، کە وەك حەتمیەتی مێژوو سەرهەڵدەدات لە قەیرانەکانی کۆمەڵگادا، کاتێ کۆمەڵگا بیەوێ بەرەو پێش بچێ بەرەنگاری کۆمەڵگای کۆن یان سیستەمی کۆن دەبێتەوە دەستەو یەخن لە ڕەگوڕیشەوە هەڵی دەتەکێنێ و کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو لە جیاتی ئەو دادەنێ و پێش دەخات، لێرەدا گەل و سەرکردە ڕۆڵ دەبینن بە تایبەتی سەرکردەی لێهاتوو لێزان و زیرەك و کۆمەڵگای هوشیار گەل هوشیار بۆ پێکهاتە مێژوویی و کۆمەڵایەتی‌یەکان و بنەماکانی یاسای گەشەکردنی کۆمەڵگاکە ئەم کارەش بەهۆی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی‌یەوە دروست دەبێت و سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت ئەمەش مێژووی کۆن و نوێ سەلماندوویەتی هەر لە بەرەبەیانی دروست بوونی کۆمەڵگاکانەوە، لە قۆناغە مێژوویی‌یە جیاجیاکانی کۆمەڵگادا هەر سەرکردەیەك بە شێوەیەك سەیر دەکراو بە بیرو بۆچونێك بناغەی سەرکردایەتی خۆی دەچەسپاندوو قایە ی دەکردو ڕایدەگرت و بە شێوەیەك ناویان لە خۆیان دەنا وەك "خوداوە، و سەرۆك عەشیرەت، دکتاتۆر، پاشا، سولتان، ئیمپراتۆر، مەلیك، پێغەمبەر، ڕەهبەر.. هتد" ئەم جۆرە سەرکردانە لە قۆناغە دژوارەکانی یار لە قۆناغە قەیراناوی‌یەکانی مێژوودا دەردەکەون و خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنن و جڵەوی سەرکردایەتی دەگرنە دەست و دەبنە خاوەنی

هەموو شتێك، زۆرجار ئەو سەرکردانە بوونەتە هۆکارێك بۆ چەقینی مێژوو لەو قۆناغەی کە تیایدا بوونەتە سەرکردەو هەوڵیان داوە زۆرجار پێشکەوتن ڕوونەدات. نە هیچ فەرهەنگێکی ژیاندا، بە تایبەتی ئەو سەرکردە کۆنەپەرستانەی کە دژی پێشکەوتن و مێژوو بوو و بوونە فاکتەرێکی گەورە لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگادا، لە سەردەمی سەدەی (بوژانەوە) ئەو دەمامکانە هەڵماڵدران و ڕاستی‌یان ڕوون کرانەوە، ئەو ڕەوتەی دوێنێ کە بە سەختترین قۆناغی کۆمەڵگا دەژمێردرێت کە مرۆڤایەتی پێوەی دەتلێتەوە تا ئێستاش بە تایبەتی ئەو گەلەی کە لە مێژوو نەگەشتووەو بە قۆناغەکانیدا بەبێ ئاگایی و بێ هوشیاری بازی بەسەریاندا داوەو تووشی سەرلێشێواوی مێژوویی هاتوودو پێکهاتەکەی شەق و شڕکردووە، دیارە جموجوڵە تایبەتی و دژایەتی چینەکان خۆیان ڕەوتی خۆیان دروست دەکەن بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگاو لەوێشەوە ڕێبەرانی خۆیان دروست دەکەن و لە دەوری خڕدەبنەوە، هەروەك مارکس دەڵێ "هەموو شتێك لە بوونەوەردا دەبزوێ.. ژیان گۆڕانی بەسەردا دێ، هێزی بەرهەم هێنەر سەرهەڵدەدات، پەیوەندیە کۆمەڵایەتی‌یە کۆنەکان دەڕوخێن" ئەو کاتانەی قۆناغی گۆڕانی کۆمەڵگا لەبەر هۆکانی گەشەکردنی بنەماکانی کۆمەڵگا بە هەموو فەرهەنگەکانیەوە گەشەیان نەکردووەو پتەو نەبوون لەوانەیەو دەگونجێ سەرکردەکان یان کەسایەتی‌یەکانی (تصادف) واتە (لە

ناکاوەکان) ناشارەزاو گێل و خائین و نێنەهاتوو ببنە سەرکردەو گەل لە ڕێ لادەن و ڕەوڕەوەی مێـژوو بـۆ کـەمێك ڕاوەسـتێنن، وەك زۆرجـار لـە مێژوودا ئەم جۆرە توخمانە پەیدابوون لـە قۆناغـە جیاجیاکـاندا ڕۆڵـی سـەرەکی دەبینـن لـە کۆنەپەرسـتی و خیانـەت و وەسـتاندنی ڕەوتـی پێشـکەوتنی کۆمەلایـەتی و کوشـتنی بنـەما هۆشـیارکەرەوەکان، کـە زۆرجار بارودۆخی تایبەتی بوونە هۆی دروست کـەریان ئـەم دروسـت بوونـە لـە میکـانیزمی مێـژوودا دەبێتـە هـۆی لـە بـارچوون گـەر لەگـەڵ پێداویستی‌یە مێژوویی‌یەکانداو بارودۆخدا نەگونجێ بۆ ماوەیەکی کەم جڵەو دەگرنتە دەست بەڵام دەپوکێتەوەو نامێنێ لەژێر فشاری کۆمەڵگاو سەرکردەی نوێدا، ئەم چینە کۆنەپەرستانە لە دەورەکانی تێك ڕوخـان و دابەش بوونی خۆیاندا ناتوانن پیاوانی گەورە بە مێژوو پێشکەش بکەن و پەنا دەبەنە بەر کەسـانی بـەفرت و فێـڵ و دڵـڕەق و تـاوان پیشـە کـە کەسـایەتی‌یەتی ڕاسـتەقینەیان نی‌یـە بـەڵام دەتوانـن بـۆ ماوەیـەك بـە بەرژەوەندی خۆیان خزمەت بکەن وە تا سەریش ئەوەیان بۆ ناچێتە سەر چونکە ڕەوتی کۆمەڵگا هەمیشـە لـە گەشـەکردندا دەبێـت و ژیـان گۆڕانـی بەسەردا دێت و هەر بۆیە لەنێو هەناوی ئەو کەسایەتی‌یە فێڵ بازانەدا کەسایتی‌یەکی ڕاستەقینە لەدایك دەبێـت لـەنێو کۆمـەڵگای هۆشـیارداو دژی ڕادەوەسـتێت و جڵـەوی سـەرکردایەتی لێ دەسـێنێت، هـەروەها دەیداتە بەر گورزی مێژوویی، ئەنگلس دەڵێ "ئێمە بە خۆمان مێژوومان

دروست د ،کەین بەڵام پێش هەر شتێك لە سایەی پێشینەو بارودۆخی تەواو دیـ ـری کراودا دروستی دەکەین کە لە دوایندا ئابووری هەرە بڕیاردەرێتی بەڵام بارو دۆخی سیاسی هی تریش تەنانەت ئەو داب و نەریتانەی لە مێشکی خەڵکدا لانەیان کردووە ڕۆڵی دیاری کراو دەبینن ئەگەرچی ڕۆڵی بڕیاردەرانەش نەبێت"، جاری وایە بەهۆی تێکشکانی هێزی شۆڕشگێڕەکان و سەرکەوتنی کۆنەپەرستان و لاواز بوونی چینە بەرەوپێش چووەکانی کۆمەڵ مەڵبەندێکی لەبار بۆ ڕمبازێن و خۆنیشاندانی کەسانی دور لە کەسایەتی بێ بایەخ و جێ گاڵتەو گەپ پەیدا دەبێ کە لەسەرەوەی کارەکان سەقامگیر دەبن و شوێنەوارەکانی خۆیان لە ڕەوتی ڕووادوەکان و مێژوودا بەجی دێڵن مارکس و ئەنگلس بەم جۆرە توخمانە "توخمە چاخ و چەرخ" بە گاڵتە دەڵێن (پیاوانی بچووکی گەورە!) ناپلیۆنی سێهەم یەکێك لەم توخمانە بوو کە (پاڵەوان) بوونی ئەو بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم کەسایەتی‌یە جێ گاڵتەو گەپەو بێ بایەخیان دەناساند بە نهێنی‌یەکی مێژوویی دەژمێردرا مارکس لە کتێبی ١٨ برومولویی بناپارتدا دەڵێ: (هۆی دنەدەرو کارگێڕ یان میکانیزمی سەرکەوتنی کاتی ئەم "پیاوە بچووکە گەورانە!" ڕوون دەکاتەوە)، کەوابێ پێداویستی‌یە مێژوویی‌یەکان سەرکردەی مەزن دروست دەکەن و پێداویستە میکانیزمەکانیش سەرکردەی گاڵتەو گەپ و فێڵ بازو خاین دروست دەکەن و دەبنە خواوەندو ڕابەرو وەك پێویستی مێژوویی لە

قەڵەم دەدرێ و تا ئەوەی دەگاتە دروست کەری مێژوویان سەرکردە وای لێدێ کە خۆی زۆر لە مێژوو بە گرنگتر دەزانێ و خۆی بە دروست کەری مێژوو دێتە پێشچاو، ئەو ساتانەشی کە بەلای کەوتنا دەچێ جڵەو لە دەستی بەردەبێ و لاواز دەبێ نازانێ چی بکات و چۆن لەگەڵ ڕەوتی مێژو گەل و خواستەکانی کۆمەڵگای نوێدا بەرێوە بچێ دەست دەداتە کوشتن و قڕکردن و تۆقاندنی گەل و شوڵ بۆ مێژوو هەڵدەکێشێ و مێژوو دەداتە بەر شوڵی کۆنەپەرستانەی و تەنانەت تاوان دەخاتە پاڵ مێژوو بەرامبەر بەو کارەساتانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوەو دەڵێ (مێژوو زوڵمی لێکردم) واتە پەنجەی تاوان بۆ مێژوو ڕادەکێشێت و خۆی لێ دەرباز دەکات، بەڵام تا سەر بۆی ناچێتە سەر چونکە مێژوو ئەو توخمانە بە کرچ و کاڵی فڕێ دەداتە دەرەوەی خۆی و هەر بە مردوویی جێیان دەهێڵێ تا ئەو کاتەی کۆمەڵگا فڕێی دەداتە زبڵخانەی مێژووەوە، کەوابێ لەنێو لاپەڕەکانی مێژوودا زۆر ناوی سەرۆک هەن بەڵام هەموویان پرشنگدارو مەزن نین مێژوو چەنددها دەناسێت کە دژی پێویستە مێژویی و کۆمەڵایەتی‌یەکان و پێشکەوتنەکان بوون، هەر بۆیە دەیانداتە بەر گورزی خۆی و دەیانکاتە وانە بۆ نەوانی دی، سەرکردەو نوێنەری چینە کۆنەپەرستەکان نەیانتوانیوە لە بەردەم شالاوی کۆمەڵگای نوێدا خۆیان ڕابگرن هەر بۆیە بەزوویی و لە زەمەنێکی کەمدا دەستەوەستان لەنێو شەپۆلی پڕ لە قینی پێشکەوتنخوازانی چینە

تیکۆشەرەکاندا سەرەو ژێر کەتن و لەناو چوون، مێژوو زۆر وانەی لەو کەسایەتی‌یانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، وەك (میرابۆی فەرەنسی) ئەرستۆکرات کە لە شێوەی نیشتمانپەروەرو گوتەبێژی شۆڕش و دڵی گەورە و دەنگی زوڵاڵی هەژاران و زەحمەتکێشان و زۆربەی چین و توێژەکان خۆی دەنواند تا دوایی لە ساڵی ١٧٩٢ داخ لە دڵی فەرەنسە ڕژێمی پاشایەتی‌یان ڕوخاندو دەستی شۆڕشگێڕان گەیشتە قاسە قایمەکانی کۆشکی ڤێرسای و گشت بەڵگە نهێنی‌یەکانی پاشایان خوێندەوە یەکێك لەو بەڵگانە هەموانی حەپەساند تیایدا هاتبوو کە: لویسی شازدە توانیویێتی لە ژێرەوە میرابۆ بکڕێت و لە نیسانی ١٧٩٠ وە میرابۆ بۆتە یەکێك لە کرێ گرتەکانی لویس کە دانیشتوانی پاریش بە مەیان زانی دیسان دەیان هەزاریان ڕویان کردە (پانتیۆن) و بە ئەوپەڕی ڕقەوە گۆڕی میرابۆیان هەڵتەکاندو پاشماوەی لاشەکەیان هەر لەوێدا سوتاندو سوتووەکانیان بردە گۆڕستانی دزو جەردەو خۆفرۆشان لە سان ماسۆی نزیك پاریس. دیارە تا سەر سەرکردە ناتوانێت مێژوو هەڵخەڵەتێنێت هەر دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بیکاتە عیبرەت و پەند بۆ کەسانی دی.

ڕاستە کۆمەلانی خەڵك مێژوو دروست دەکەن و ئەرکەکەش دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان بە تایبەتی شۆڕشگێڕان کە دەبنە سووتەمەنی، بەلام سەرکردەش ڕۆڵی گەورەی ئەو گۆڕانە دەبینێ و ڕۆڵی مێشك و

ئاراستەکەر دەبینن کە بە هۆیەوە دەبێتە پێداویستی مێژوو، کە چۆن وەڵامی پێویستی‌یەکان دەداتەوەو چۆن کۆمەڵگا بەرەو پێشەوە دەبات و دەستیان دەگرێت و لە هەڵدێرو لەناوچوون رزگاریان دەکات و لە هەمان کاتدا ڕەورەوەی مێژوو بەلای خۆیدا وەردەچەرخێنن و هێزو توانای خۆشی هەر لەو بزوتنە کۆمەڵایەتی‌یە پێشکەوتنخوازەوە وەردەگرێ و دەیکاتە ئاگری شۆڕش بۆ لەناوبردنی توخمە کۆنەپەرستەکان و خاڵێکی گۆڕان و پێشکەوتن لە مێژوودا دروست دەکات، کە هەمیشە بناغەی ئەو پێشکەوتن و مێژووە کۆمەڵگا خۆی‌تی، کەوابێ تاکەکەس هیچ شتێك ناگۆڕێ بێ کۆمەڵگا "کۆمەڵگایەکی هوشیار" هەروەك چۆن سەرکردایەتی بەرزبوونەوەو پێشکەوتن هەیە بە هەمان شێوەش سەرکردایەتی دواکەوتن و ڕوخاندن هەیە بە واتایەکی تر سەرکردایەتی ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی کە لە قۆناغی گەندەڵی و ڕوخاندا ژیان بەسەر دەبەن ئەوانیش ڕۆڵێکی دیاری کراویان هەیە بۆ نموونە ئیرۆن لە سەردەمی ڕۆخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی‌دا دەرکەوت هەروەها سوڵتانەکانی عوسمانیش لە کاتی ڕوخاندنی قۆناغی دەرەبەگایەتی‌دا سەریان هەڵدا سەرکردە فاشیەکانیش بە هەمان شێوە لە سەردەمی قەیرانەکانی سەرمایەداری‌دا دەردەکەون. ئەمانەش هەموویان لە سەپاندنی کۆنەپەرستی و زۆرداری و قڕکردن بەسەر کۆمەڵگا ڕۆڵێکی دیاری کراویان گێڕا. ئەم کەسایەتیانەش لایەنی کەم یان بە ڕادەی

شێوازەکە ی دیکەی سەرکردایەتی خاوەنی دەسەلاَت و نفوزو فرۆفێلّ بە توانان، ئەم سەرکردانە بە زۆری لە قۆناغە مێژوویی‌یە دژوارەکاندا بە تایبەتی دەردەکەون، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشمانداو لە مێژووی نوێدا ئەو جۆرە توحمانە، یان ئەو سەرکردانە بە شێوەیەکی کەم و بە شێوازێکی دی بەرچاو دەکەون واتە هێشتا هەن لە کۆمەلّگاداو ڕۆلّی خۆشیان دەبینن.

سەرچاوەکان:

١-دەروازەی گۆڕانی کۆمەلّ- بەیاد عەبدولقادر ١٩٨٧.

٢-فێرکردنی فەلسەفەی زانستی- ئیحسان تەبەری وەرگێڕ د. حسین خەلیقی بەغداد ١٩٩٤.

٣-اشتراكية ام فوضوية- جوزيف ستالين- ترجمة جورج طرابيشي بيروت ١٩٧٨.

٤-ماركس الثامن عشر من بروميل لوير بوناثارت المجلد الاول الجزء الثاني ترجمة الياس شاهين- دار التقدم موسكو ١٩٨٠.

٥-مێژوو- د. کەمال مەزهەر.

٦-گۆڤاری میدیا- ژمارە (٢) سالّی (١) نیسانی ١٩٩٣.

# کەرەستەکانی مێژوو

مرۆڤ هەر لەبەرەبەیانی هوشیاربوونەوە هەوڵی داوە بگاتە ڕاستییەکان بە تایبەتی دەوروبەر چونکە بێدەوروبەر مرۆڤ مەحاڵە بژی و پێشبکەوێ، هەروەها گەڕان بۆ دۆزینەوەی شتە ئاڵۆزەکانی دەوروبەر بۆ گەیشتن بە ئامانج و لەوێشەوە ڕۆشنایییەک بخاتە سەر لاپەڕە شاراوەو تاریکەکانی ژیان کە تیایدا ژیان و مرۆڤ گەورەترین کێشەیان دروست کردووە، کە بوونەتە هۆیەک بۆ دواکەوتن و پێشکەوتنەکار هەروەها ململانێی نێوان خۆیی و دەوروبەری خۆیی و خۆی. خۆیی و دەردوون، خۆیی نهێنییەکان، خۆیی و ئەفسانەکان، کە ئەمە بووە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ گەشت مرۆڤایەتی تێگەشتنی لە هۆو هۆکارەکان و ئەندێشەکان، بەم پێیە گەڕاوە بەنێو ورگی زەوی‌داو پرسیار کردن لەخۆ، ئا لێرەدا لە چەمکی مرۆڤی دوێنێ (مرۆڤی کۆن) دەباز بووەو بەرەو مرۆڤی کەمێ هوشیار خۆی ئاشناکردو هەروەها زانینی

دەوروبەرو بەکارهێنانی دەوروبەر بۆ خزمەت کردنی خۆ کە لێرەوە دژایەتی‌یە دەروونی و فسیۆلۆژی‌یەکان سەریان هەڵدا، کە دواجار بوونە بنەڕەتەکانی بناغەی فەلسەفەو فەیلەسوفان و قوتابخانە فەلسەفیەکانی لەسەرشان دامەزرێنرا، دیارە دوێنێی مرۆڤ واقعێکی نەستی لای مرۆڤ کە خۆشی بێئاگابوو لە گۆڕانکارییەکان و پێشکەوتنەکان، زۆرجار خودی سروشت دەبووە هۆی گۆڕانکارییەکان لە دەوروبەردا بێ ئەوەی مرۆڤ دەستی تێدابێ یان دەستی مرۆڤی بەرکەوێ، کاریگەری کردنی سروشت لەسەر مرۆڤ گەورەترین کاریگەر بوو لەسەر ژیانی و پاشەڕۆژی و هۆشیاربوونەوەی کە بە یەکەم فەلسەفەی وێنەداری پێناسەکرابوو کە سروشت وەك بارێکی گران بەسەریدا زاڵ بووبوو، بەڵام مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی باشتر، بەنێو ورگی زەویدا دەگەڕا لێرەشەوە مرۆڤ لە هەندێ پێشکەوتنە تەسکەکانەوە توانی لەو دەوروبەرو واقیعە دەرچێ و بەرەو جیهانی نوێ و رۆژگارێکی نوێتر قەڵەم بازبدات وەك قۆناغێکی سەرەتایی پێشکەوتن لە سروشتی ترسناك و دەنگە نامۆکان بکۆڵێتەوەو بیانکاتە وەڵام بۆ بیرکردنەوەکانی وەك کەرەستە بەکاریان بهێنێ و بیانخاتە بەردەم ڕۆشنایی بیرکردنەوەکانی، سەرەڕای ئەوەی بە چەند قۆناغی عەقڵ و لۆژیك و مێژوویی و ئارکۆلۆژی و ئیتنۆگرافی و کۆسمۆگۆنیاو سایکۆلۆژیاداو گەڕان بە شوێن لاپەڕە تاریکەکانی پەڕاوو کتێبەکان، تا ئێستاش دوێنێ کە مرۆڤی سەرسام کردوەو ئێستاش زۆر

شت هەن بوونەتە هۆی سەرسام کردنی مرۆڤ بۆ فێربوونی شت لێوەی یان مێژووی ڕووداوو کارەساتەکانی بۆ دەرکەوێت یان بیانکاتە سەرچاوەیەك بۆ کەرەستەکانی مێژوو یان بۆ بەڵگەکانی بوونی شارستانیەت.. هتد، بە تایبەتی بەڵگە ئەفسانەیی‌یەکان کە ئەو حاڵەتە دەروونی و سروشتیانە دەردەخات کە هەر لە سەرهەڵدانی شارستانیەتەوە لە دەروونی مرۆڤدا جێگیر بووەو لەگەڵ گەورەبوونی مرۆڤدا گەورە دەبێ و تاریکایی‌یەکانی ڕۆژگاری کۆن یا ڕۆشنایی‌یەکانی ڕۆژگاری کۆن نیشان دەدات، کە لە هەمان کاتدا دەبێتە کەرەستەیەکی مێژووی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، کە هەموو گەلێك بەشی خۆی ئەفسانەی هەیە، یان بە هۆی ڕووداوەکانی جیهانەوە بوەتە خاوەن ئەفسانە کە ئەمەش ململانێ‌یەکی زۆری لەسەرە، هەر بۆیە ئەفسانە وەك کەرەستەیەکی مێژوو زمانحاڵی دوێنێی مرۆڤی کۆنەو لە هەمان کاتدا زمانحاڵی مرۆڤی نوێی ئەمڕۆیە بۆ سیماکردنی شارستانیەتی و بوونی ڕەچەڵەکی و دواییش بوەتە بناغەی خێزان، قەبیلە، کۆمەڵگا، دەوڵەت، ئەو شتانە دەبنە هۆکارێکی گرنگ و کەرەستەیەکی مەزن بۆ بەشارستانیی‌یەتی بوو، یان بە مێژووبوونی گەل، زۆرجار لە تێڕوانینە جیاجیاکانی فەلسەفەو ئاین و ئەفسانەو میسۆلۆژیای خۆیانەوە خۆیان کردووە بە "گەلێکی هەڵبژاردەی خودا" کە لەم ڕۆژگارانەدا ئەو پڕوپاگەندانە دەکەن بۆ خۆیان ئەویش لەبەر تیشکی ڕەگەزپەرستانەی

خۆیانەوە، بەمەش مافی گەلانی دیکە گەلانی دەوروبەر پێشێل دەکەن و ماکە نەتەو یەتی‌یەکانی لێ دەسەندن و لێی زەوت دەکەن، بە تایبەتی ئەو گەلانەی کە زۆر لە شارستانیەتی‌یەکەی نامۆ کراوەو لیخن کراوەو بەمێژووبوونی لێ سەندراوەتەوە.

مرۆڤی کۆن دوو شتی لێ بەجێماوە ئەویش (وشەو بەرد)ە کە بوونەتە بناغە بۆ شتەکان، بەرد ناتوانێ خۆی بەرامبەر باروڕۆخە سروشتی‌یەکان ڕابگرێ، چونکە تووشی سووانەوەو ڕوخان دەبێ و دووریش نیە لەناوبچێ، بەشێکی کەمی خۆی ڕاگرتووەو ماوەتەوە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەی توانای عەقڵی نادەمیزادو داهێنانی، کارەساتی (لافاوە جیهانی‌یەکە) کە گەربۆڤسکی لێی دەدوێ بووەتە هۆی ڕماندنی زۆر لە ئەشکەوت و شارستانیەت، ئەم لافاوە لە پەڕاوە پیرۆزەکانی زۆربەی گەلاندا باسی لێوە کراوە، وەك نووسراوە سۆمەریەکان و چیرۆکەکانی ئینجیل و ئەفسانەکانی هندی‌یە سورەکانی گۆمی (ئامەزۆن) و هەروەها پەڕاوی پیرۆزی (زەند-ئاوێستا) ئاماژەیان بۆ لافاوەکە کردووەو گەربۆڤسکی باس لە شارستانێتی ئەشکەوتە باوبانگەکەی (شانەدەری) لە شاخەکانی کوردستاندا دەکات وەك ئەرشیفێکی شوێنەواری شارستانی و مێژوویی مرۆڤایەتی بە درێژایی (١٠٠٠٠٠٠) ساڵ، کە ئەمەش بوونی کوردو شارستانێتی کورد دەسەلمێنێ کە گەلێکن وەك گەلانی جیهان، خاوەن ئەفسانەو خاوەن مێژووی خۆیانن، دووەم شتی

لێ بەجێماوی مرۆڤی کۆن (وشە)یە، وشەش لە قوڵایی دەروونی مرۆڤدا بە زیندوویی ماوەتەوەو بۆیە یاریدەدەرێکی هەرە دیارو گەورە بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان و گەورەترین سەرچاوە بۆ گەشانەوەو هۆش و بیرو، ئامرازێکی دەربڕین بووە هەر لە بەرەبەیانی مێژووی هۆشی مرۆڤی دابڕاو لە ئاژەڵێتی خۆیەوە تاکو ئەمڕۆ، گەورەترین ڕۆڵ دەبینێ لە ژیانی مرۆڤدا، مادەیەکی سەرەکییە بۆ بوونی ماکە نەتەوەیییەکان، وشە لە ژێر کاریگەری فەلسەفەو دەوروبەردا کە لە چەند هەستێکدا خۆیان بەدی دەکەن و لە یەکتری کاردەکەن بەهۆی (لێك خشان لەگەڵ سروشتدا) یان (لێك خشان لەنێو سروشتدا)، کە دوایش دەبنە هۆی دروستبوونی زمان بۆ گوزارشت لە توێژاڵە دەوروبەرەکان.. یان دیاردە دەروونیەکان.. هتد...، وشە لەسەر شوێنەوارە کۆنەکان هەڵکەندراون بە شێوەیەکی وێنەیی کە گوزارشت لە ڕوودانی کارەساتێك دەکات، یان شێوەی کەسێك یان ئاژەڵێك کێشرابێت کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی مێژوویی شارستانێتی دەردەخات. ئا لێرەوە زاناکان گەڕان بە دوای شارستانێتی و فەلسەفەو ئایین و ئەفسانەو خواوەندەکان و لە ڕێی ئەم کەرەستە کۆنانەوە کە پاشماوەی مێژوویەکی پێش مێژوون بۆ ڕوونکردنەوەکانە دەربارەی ئادمیزادو زانست و دەوروبەرو.. هتد لە ڕێی ئەم کەرەستانەوە بگەنە مێژووی مێژوو. یان بەرگی زا، ست بکەن بە گیانی مێژووداو هیچ گەلێکیش مافی نەخوریێ لەو شار، ستانیەتدا،

ئەم بیروباوەڕانە وایان لە زاناکان کرد، وایان لە مێژوونوسان کرد، کە دوای نوسراوو شوێنەوارە کۆنەکان بکەون، ئەویش زیاتر لە دووتوێی، پەڕاو پیرۆزەکاندا کە بەنرخترین کەرەستەن بۆ مێژوو، هەروەك ئەنگلس دەڵێ (ئەو شتانەی دەماودەم لە گەلانی ڕابردووەوە گێڕاونەتەوە هۆیەکی سەرەکین بۆ ڕاستکردنەوەی زانیاری دەربارەی کەرەستەی مێژوویی دیاری کردنی یەك بەدوای یەکی هاتنیان بۆی مێژوونوس پێویستە هەوڵی ئەوە بدات کە لە چیرۆکی دەماودەم و سەرچاوە ئاینییەکاندا ئەو مەبەستانە بدۆزێتەوە کە بتوانری بکرێت بە بنچینەی زانیاری) یەکەم قۆناغی بیرکردنەوەی فەلسەفی مرۆڤ ئەفسانە بوو، مرۆڤی کۆن لە ڕێی ئەفسانەوە دەدوا، نەك لە ڕێی زمانەوە، چونکە کەرەستەکانی زمان پێشکەوتوو نەبوون و نەشیدەتوانی زمانەکەی پڕ بە پێستی خۆی بەکاربهێنێ کە ستێرك (هدف) بپێکێ، هەربۆیەش تیشکی خۆری بە پەنجەی خواوەندەکان ئەشوبهاندو هەورە پڕ ئاودارەکانیشی بە مانگای گوان پڕ لە شیر ئەشوبهاند، ئەفسانەکان هەستی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و بیرکردنەوەی سەرەتایی دەردەخات سەبارەت بە گەلێك یان بوونی نەتەوەیەك کە دواجار بووەتە گەورەترین هۆکار بۆ پێشکەوتنی شارستانیەت هەر لە سەردەمی مرۆڤایەتیەوە.

# جۆرەکانی ئەفسانە :

١-ئەفسانەی (گەردون): کە ئەمەش وردبوونەوە بووە لە ڕژێمی گەردوون و هەوڵدان بۆ لێکدانەوەی بوونە.

٢-ئەفسانەی هۆدۆزی (تعلیلی): کە ئەمەش هەوڵدانێکە بۆ لێکدانەوەی شت لە سەردەمێکدا کە شێوازێکی زانستی‌یانەی تیادا نەبووە.

هەروەها (جیمس فرێدەر) کە ڕابەری (قوتابخانەی پەرەسەند)ە بە پێی لێکدانەوەی ئەم قوتابخانەیە ڕەگەزی مرۆڤ لە مەسەلەی پەرەسەندنی شارستانێتی‌دا بە سێ قۆناغ تێپەڕ دەکات:

١-قۆناغی سیحر.

٢-قۆناغی ئایین.

٣-قۆناغی زانست.

کەوابێ مانەوەو لەناونەچوونی زۆربەی شتە کۆنەکانی دوێنێی مرۆڤی کۆن گومانی تێدا نی‌یە کە بووەتە سەرچاوەی گەلێك سەرهەڵدانی بیری

زانستیو مێژوویی، دوایش سەلماندنی ڕەچەڵەك و ڕەگەزی گەلانی کۆن و هەروەها ئاستی بیرو هۆشی مرۆڤی کۆن لە ڕووی ئابووری و سایکۆلۆژی و میتۆلۆژیەوە، وەك هەرەمەکانی میسر، باخچە هەڵواسراوەکان بابل، ئەشکەوتەکانی شانیدەر.. هتد، کە بوونی گەلان و نەتەوەکان دەسەلمێنن و بوونەتە کەرەستەکانی مێژوو، واتە مێژوو بەر لە مێژوو بەهۆی دەماودەم و نووسینەوەو پەڕاوە پیرۆزە ئاینییەکانەوە بۆ ئێمە بەجێماوە بەر لە دۆزینەوەی نووسین مێژوو بەهرەیەکی گشتی زۆر ساکار بوو، بریتی بوو لە گێڕانەوەی پشتاوپشتی بەسەرهاتی ڕابردوو لە شێوەی داستان و چیرۆکدا، ئەفسانەو داستانەکان بۆ نەوەی داهاتوو کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ژێر کاریگەری لێکۆڵینەوەکانداو خەیاڵی فراوانی ئەوەمیزاددا شتێکی نوێتری دەخستەسەر، یان لەسەری لادەبرد، زۆرجار بەپێی بەرژەوەندییەکان ناوەرۆکی ئەفسانەکان دەشێوێنرا یان هەر موڵکایەتیەکەیان لە گەلان دەسەند بە زۆری زۆرداری و گەلێ ڕەچەڵەکیان بێبەش دەکرد لە ئەفسانەکانی و دوایش ناسنامەی نەتەوایەتیان دەسڕایەوە، داستانی گلگامش یەکێکە لە نیپۆسە هەرە کۆن و گرنگەکانی مێژوو کە دەورووبەری چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بە زوبانی ئەکەدی (بابلی) بە شیعر نوسراوەتەوەو بە درێژایی ئەو سەردەمە باس کراوە.

هەروەها ئیپۆسەی (ئیلیادە) کە بەرهەمی (هۆمیرۆس)ی شاعیری گریکی باسی لەسەرهاتەکانی دوا ساڵی شەڕی تەڕوادە دەکات کە دەروبەری (٢٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر ڕووی داوە.
(ئۆدیسا)ش ئیپۆرسێکی تری گریکی‌یە دیسان بەناوی هۆمیرۆسەوە ناسراوەو پڕ لە زانیاری‌یە دەربارەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری ئە و سەردەمە کۆنەی مێژوو، زاناکان بە ئەفسانەو داستانەکان ڕانەوەستان و چوونە نێو لاپەڕە تاریکەکانی شاعیران و کتێبە کۆنەکان کە لە نێوانیانیادا زۆر شتی شاراوەیان تیا دۆزیوەتەوە، بۆ وێنە (گ. شلیمان) زانای ئارکیۆلۆژی ئەڵمانی بەهۆی وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لە چەند دێڕێکی ئادیای هەڵبەستەکانی ئەلیادە)ی (هۆمیرۆس) توانی شوێنەواری شاری (تەڕوادە)ی ئەفسانەیی بدۆزێتەوەو سەرلەنوێ کەلاوەکانی بخاتەوە بەر تیشکی ڕووناکی و ئەو تەڕوادەیەی کە هەتا ئەوکاتە بە ئەنجامی بیرێکی لە خەیاڵدا دروستکراو دادەنرا بیکاتە ڕاستی ون نەبوو. هەروەها فیردەوسی لە (شانامە)کەیدا بە چەشنێکی ئەفسانەئامێز مێژووی دێرینی ئێرانی نووسیوەتەوەو کتێبەکەی بووەتە سەرچاوەی مێژوو بۆ ئێران وەك سەرچاوەیەکی بەنرخ بە تایبەتی لای کورد چونکە لاپەڕەیەکی شاراوە دیاری دەخات لە ئەفسانە. کورد، مارکس و ئەنگلس دژی بیروباوەڕی ئایینی ڕاوەستان و بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئینجیل بەسەرچاوەیەکی مێژوویی دەزانن بۆ بە لە

شیکردنەوەی (خەونەکەی یوحەننای پیرۆز)دا کە یەکێکە لە هەرە تاریکترین بەشەکانی ئینجیل. ئەنگلس دەڵێ (ئەم بەشە بە جۆرێکی وا ژیانی سەدەی عیسایی سەردەمی سالی ٦٨٠ی (پ.ز) تێدا ڕوون و ئاشکرایە دەڵێی لە ئاوێنەدا دەیبینی) ئەمە دەرخستنی دوێنێی کۆنە لە پەراوێز ئەفسانەو داستانە کۆنەکاندا، دیارە بلیمەت و زانایان دەورێکی گرنگیان هەبووە لە ژیانەوەی شارستانیەت و ژیانەوەی ڕەچەڵەک و لەوێشەوە بۆ کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو، هەر لەژێر تیشکی بە مێژووکردنی مێژوو ف. بریوسۆف دەڵێ (ئێمەی بلیمەت و شاعیر پارێزەری نهێنی و بڕوا، مەشخەڵی نەکوژاوە هەڵئەگرین بۆ ڕوونکردنەوەی زیندانی ژێرزەوی و بیابان و ئەشکەوتەکان)، کەوابێ مێژوونوس و زانا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە ڕۆشکردنەوەی لاپەڕە تاریکەکانی ژیان بۆ گەیشتن بە ژیانێکی ڕوون و ئاشکرا، زۆبەیان ژیانی خۆیان تەرخان کردووە بۆ ئەو مەبەستانەو بۆ ڕوون بوونەوەی هەر ڕووداوێک لە هیچ شتێک نەسڵەمیونەتەوەو زانستەکەیان وەک چەکێک بەکارهێناوە.

# به زانست کردنی کەرەستەکانی مێژوو یان بەکارهێنانی مێژوو وەك ئامراز

زاناکـان تێکۆشـاون و قوربانیـان دەدا بـۆ بـە زانسـت کردنـی دوێنـێی مرۆڤی کۆن لـە پێناوی بەیانی و پاشەڕۆژی مـرۆڤ و مرۆڤایەتیدا، کـە ئەمەش جێی مەترسی بوو بۆ پیاوانی ئایینی، هەر لەسەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی و ئایینی لـە سەردەمەکانی ئیمپراتۆریەکان و مەمالیکەکان و پیـاوانی کەنیسـە کــە ببونــە گــەورەترین کۆسـپ لــە ڕێــی زانــاو پێشکەوتنەکاندا، لـە لاوازی حوکمـی ئیمـپراتۆرو مـەمالیك و پیـاوانی دەوڵـەت شۆڕشـی ریفۆرمیسـتی دینـی سـەر هـەڵداو وەك بـەرەو پێشکەوتنێك بە هـۆی هۆکاره تـەنگ و چەڵەمـەکانی پیاوانی دەوڵـەت، هەروەك چۆن کەنیسەی مەسیحی لە کاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کۆنـدا دروستبوو دوای ئەوەی دەوڵەتی ڕۆمانی نـەماو کەنیسـەی کاسـۆلیکی جێی گرتەوەو پیاوانی ئاینی دەوڵەتیان گرتە دەست و ئەوجا ململانێ لە نێوان پیاوانی ئایینیو پیاوانی زانستخواز دەستی پێکرد، زاناکان

دەیانویست، مێژوو و ڕەوتی مێژوو بەرەو پێشەوە ببەن و مرۆڤ لە کۆتی وەهم ڕزگار بکەن و هۆشیاری بکەنەوەو لە ئەندێشەی ڕەشبینی و کۆیلەتی ڕ کری و لێبەجێماوی دووربخەنەوەو بەرەو ڕێی زانستیانە بەرن، بەڵام پیاوانی ئاینیی لە جیاتی ئیمپراتۆر بە شێوەی (پاپا)کان هاتنە نێو کۆمەڵ و کورسی حوکمیان گرتە دەست و خۆیان کردە (نوێنەری یەزدان لەسەر زەوی و لە ڕێی پیاوانیانەوە وەك دەستورێکی دەوڵەتی نامەی کەنیسەی مەسیحیان بڵاوکردەوەو تا گەیشتنە ڕادەی دروستکردنی خوێندنی زانستی لاهوتی کەنیسەی مەسیحی و ئەمەش بەهۆی هەندێ بیرۆکەوە بوونە دروستکردنی بناغەکانی ئاکاری کەنیسەی کاسۆلیکی بەهۆی هەندێ فەیلەسوفە لاهوتیەکانەوە کە باسی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خواوەندی دەکرد یان چارەنوسی مرۆڤ لە پاشەڕۆژدا، یان لێکۆڵینەوەی لاهوتیان لەسەر مرۆڤ و دروستبوونی لەنێو فەلسەفەکانیاندا بووە ڕوکنێك بۆ ڕوکنەکانی دینی مەسیحی و لە چەرخی ناوەڕاستدا سوڵتەیەکی گرتە دەست (سوڵەیەکی سیاسی) و لە هەموو جیهاندا بڵاوبوونەوەو لە دەوڵەتیش خۆیان جیاکردەوەو سەربەخۆ بوون، وایان لێك دەدایەوە کە کەنیسە لە سەرو دەوڵەتەوەیە، دوای دۆزینە جوگرافیەکان و پێشکەوتنی ئابووری هەلپەی خێزانە مەمالیکەکان و بەربەرەکانیان لە نێوانیان بۆ خۆدەوڵەمەندکردن تا لێرەدا (پاپا)کان و پیاوانی ئاینیی چوونە نێو ئەو قوڕاوەوەو بوونە مشەخۆرو

پارەخۆرو کەوتنە پول خڕکردنەوەو ئەمەش هۆکارێکی ترسناك و گەورە بوو کە زاناکان دەیانگرت لە پیاوانی کەنیسە بەڵام لە سەدەی شانزەدا ئەم ململانێ‌یە گەیشتە ترۆپك و بوو بە ململانێی ڕامیاری و باری گۆڕی و دەرەبەگ و پیاوانی ئایینی تێکشکان و کە هۆکاری پاشاو حکومەتە نەتەوەیی‌یەکان کە دواجار ئەو دوو جۆرە حکومەتانە دروستبوون و بوونە هاندەر بۆ بڵاوکردنەوەی هەستی نەتەوەیی و خۆشەویستی نیشتمان، دوای ئەوەش قوتابخانەی (کالڤن) (کالڤانیەکان) و قوتابخانەی (مارتن لوسر) (لوسەری) کە بوونە هۆی دروستبوونی بیروباوەڕە جیاوازەکان لەنێو کەنیسەدا، کە کەنیسەی (پروتستانتی) (بزوتنەوەی یەسوعیەت) بەم شێوەیە تا گەیشتە ئەوەی بەهۆی شۆڕشی دینی‌یەوە کەنیسەی مەسیحی ببێتە سێ بەش (اروسوزکس، کاسۆلیك، پروتستانت) لەو سەردەمەدا هەموو بیروباوەڕەکان لەژێر دەسەڵاتی کەنیسەدا بوون، پیاوانی دینی هەموو شتێکیان خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان ئەوانیش بەپێی ئەو چین و کۆمەڵانە کە بەشێکیان پێك دەهێنا لەو کۆمەڵگا دواکەوتووەدا، هیچ نووسەرێك و هیچ هونەرمەندێك بۆی نەبوو سەرپێچی لەو یاسانە بکات کە پیاوانی ئایینی دایانڕشتووە، ڕاستی‌یەکەشی هەر ئەوەبوو بەو جۆرە بێ چونکە ئەوانیش بە ڕۆشنبیری ئایینی پەروەدەکرا بوون و گۆش کرابوون کەنیسەو بیروباوەڕی ئایینی مەسیحیش سەرخانێکی گونجاو لە باری بنکە

ئابووریەکەی دەرەبەگایەتی پێکدەهێنا، هونەر وای لێهات رەشبینی پێوە درابێت تا ئەوەی کاریان دەکردە سەر جەماوەر پیاوانی ئایینی ناچار بوون بە شوێن رێگایەکی تردا بگەرێن کە بیکەنە، بەربەستێك لە نێو هونەرمەندو زاناو جەماوەردا تا هونەر بکەنە ئامرازێك بە هۆیەوە خزمەتی خۆیانی پێبکەن، بەلام لە قۆناغی دووەمدا لە نێوان ناکۆکی کۆمەلگای دەرەبەگایەتی و پیاوانی ئایینی و پاپاکان و راپەرینی جوتیاران و پیشەگەران لە بەرهەمەکانیان رەنگیان دایەوەو بەرەو ریالیزم نزیك بووەوە، دواتیش لە ئەنجامی گەشەکردنی باری ئابووری کۆمەلگای ئەورووپی نووسەری وەك (دانتی) (پەتراك) (پوکاشیو) هاتنە مەیدان حەقیقەتی سیستەم و دام و دەزگای کەنیسەیان بۆ خەلکی روونکردەوەو ئاشکرایان کرد، ئەمە سەدەی رێنیسانسی گرتەوە (سەدەی بوژانەوە) پاش ئەوانەیش (داڤنشی) و (ئەنجیلۆ) و (شەکسپیر) و (رۆفائیل) هاتنە سەر شانۆی ژیان و شان بە شانی شارستانییەتی نوێ رۆلی مێژوویی خۆیان بینی، تەوەری سەرەکی (سەدەی بوژانەوە) (ئادەمیزاد) بوو کە هەموو شت پێشتر بوو لایان، شەپۆلەکانی جەنگ و داگیرکردن و بارزگانی و بەربلاوی ئابووری دەستی پێکرد وەك شەپۆلی سوپای خاچداران کە بووە هۆی سەرهەلدانی هەستی نەتەوەیی لە نێوان ئەو گەلادا کە بەشداری شەریان دەکرد بە تایبەتی ئینگلیزو فەرەنسی و ئەلمانی لێرەدا رێرەوی دینی گۆردرا بۆ رێرەوی نەتەوەیی و نیشتمانی

و دوایی ئەدەبی نەتەوەیی سەریهەڵدا واتە نووسین بە زمانی نەتەوەیی.
هەروەها شارستانێتی ئیسلامیش کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئەورووپا
کە بۆی کشا لە کۆتایی سەدەی پانزەدا، زانایان بۆ ئەوەی لە دەستی
پیاوانی کەنیسەو ئاینی ڕزگاریان بێت کەوتنە خۆئامادەکردن و
شێوازی نوێی جۆربەجۆریان دۆزیەوە تا بەهۆیەوە بەربەرەکانی
سیستەمی کۆن و بیروباوەڕی دەرەبەگایەتی پێبکەن و پەردەیان لەسە
ڕەهەڵماڵن، بۆ ئەم مەبەستە ڕێگای ژیاندنەوەی کەلتووری کۆنیان گرتەبەر
بە تایبەتی کەلتووری یۆنانی، ئەوان وا بۆ مەسەلەکە دەچوون گوایە
بەهۆی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆنەوە دەتوانن لە یاساکانی سروشت
تێبگەن لەم ڕوانگەیەوە ئەم ڕێبازە فیکریە نوێیە بەناوی ڕێنیسانسەوە
هاتە نێو مەیدانەوە کە قەڵەم بازێکی گەورە بوو بۆ پێشکەوتنی گشت
مرۆڤایەتی و چەندین داهێنانی بەخۆیەوە بینی کە مرۆڤایەتی شانازی
پێوە دەکات هەروەها تەوژمێکی بە هەموو بوارەکاندا، ئەورووپا بە
ئاگاهاتبوونەوەو بە پەرۆشەوە هەڵپەی بۆ زانستی نوێ دەکرد جا
لەبەرئەوەی ئارەزووی لە زانست و زانیاری نوێ بوو کەوتنە هەڵپەو
گەڕان و پشکنین بەدوای لایەنە پشتگوێ خراوەکان بە دەیان فەیلەسوف
و مێژوونوسی هێنایە کایەوە کە بیروباوەڕیان تەواو بیروڕای کۆمەڵی
دەرەبەگایەتی سەدەکانی ناوەڕاستی هێنایە لەرزین و بایەخێکی
تایبەتی‌یان دا بە وەرگێڕانی کتێبە ئایینی‌یە کۆنەکان، بەڵکو هەڵەی

ناقۆلایـان تیـا دەدۆزیـەوە هـەروەها بـۆ یەکـەمجار تـەواوی بەرهەمـە ناودارەکانی شاعیرانی گریکیان وەرگێڕا لەوانە (ئەلیادە) و (ئۆدیسا)ی (هۆمیرۆس) و جگە لە بەرهەمە فەلسەفی‌یە کۆنـەکانیش، پێشـەوایانی (سـەدەی بوژانـەوە) وەك (دانتـی ١٢٦٥-١٣٢١ز) و (پـەتراك ١٣٠٤-١٣٧٤ز) و (داڤنشـی ١٤٥٢-١٥١٩ز) و (میخـائیل ئـەنجیلۆ ١٤٧٥-١٥٦٤ز).. هتد، لە سەردەمی (بوژانەوە)دا بایەخێکی زۆر بە شوێنەوارە دێرینەکانی ڕۆژهەلات درا بۆیە زانیاری مێژوو لە ڕیزی پێشەوەی ئەو زانیاری‌یـە مرۆڤایەتی‌یانـە دادەنـرێ کـە بیروبـاوەڕی (بوژانـەوە) کـاری تێکردن بابەخدان بە کەلەپووری کۆن بۆ ئەوە بوو ڕۆشـنایی‌یەکی بەتین بخرێتـە سـەر لاپـەرە شـاردراوەو نادیارەکـانی مێـژووی سیاسـی و ڕۆشنبیری کۆمەلایەتی ئەوروپا لە سەردەمی گریك و ڕۆماندا لەوانەش (ماکیـاڤیللی ١٤٦٩-١٥٢٧ز) کـە بـە دیـارترین مێژوونوسـی سـەردەمی (ڕێنیسـانس) دەژمێردرێ، ئـەو سـەردەمە گرنگـترین سـەردەمی ئـالتونی مێژوونوسـان و زانـاو فەیلەسـوفەکان بەرامبـەر بـە لێکۆلینـەوەکان بـە مەبەستی شـارەزابوونی مێژوویـی بەر لە زایین یەکێکە لەو بابەتانە لـە سەردەمی (بوژانەوە)دا سەری هـەلداو پەیوەندییـەکی ڕاستەوخۆی بـەو قۆناغەوە هەیە لـە لایـەکی تریشـەوە لێکۆلینـەوەی مێژوویـی گۆڕانێکـی بنەڕەتی بەسەردا هات و مێژوونوسان لە ڕوانگەیەکی نوێوە دەیانڕوانیە کارەسـاتە مێژوویی‌یـەکان و ڕۆلـی تاکەکەسـیان تیـادا دیـاری دەکـرد،

ئەوانە بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە لە سەرچاوەو لێکۆڵینەوە مێژووییە تۆمارکراوەکان وردەبوونەوە بەمەش نەك هەر دەستیان خستەسەر ناتەواوی کەم و کوڕی یەکانی ئەو سەرچاوە کۆنانە بەڵکو چەندین حەقیقەتی مێژوویی گرنگیان چەسپاندو بەهۆیانەوە بیروڕای دەرەبەگایەتیان یەکالا کردەوە، هەر لەو سەردەمەدا بوو واتە لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا مێژوونوسان بۆ یەکەمجار مێژوویان بە پێی سێ قۆناغ دابەشکرد لەو ڕۆژگارەدا، نووسینی مێژووی نەتەوەیی داهاتووە و مێژوونوسانی (بوژانەوە) کەوتنە باسی نیشتمان و پاشەڕۆژی بە شێوازێکی هەست بزوێن، کۆتاییان بە کۆتکردنی یان بە کۆیلەکردنی مێژوو لە لایەن کەنیسەوە هێنا. مێژونوسانی ئەو سەردەمە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ کەنیسەدا دانویان نەدەکولا بۆ خەڵکیان دەنووسی و دەیانویست لە ڕێگەی مێژووەوە وریایان بکاتەوە، مێژوونوسی ئیتالیایی (لیۆناردۆ برونی) دژی هەموو شتێك وەستا کۆمارو نیشتمانپەروەری بەلایەوە دەرسی یەکەمی مێژوو بوون و هەر لەبەرئەوەش شەیدای مێژووی ڕۆمانی کۆن بوو، لە سەردەمی شۆڕشە بۆرژوازییەکاندا زیاتر مێژوو قاڵبی زانستی وەرگرت، تا ئەوکاتە مێژوو نەیتوانی بە تەواوەتی ڕیشەی هەموو پێوەندییەکانی خۆی بە کڵێسەو دەزگا ئایینییەکانەوە بپچڕێت، ڕێبازی زانیاری پەرەی سەند ڕووناکبیران وەك (جان جاك ڕۆسۆ) و (ڤۆلتێر) و (کانت) ئەمانەش

سووربوون لەسەر ئەوەی مێژوو ڕاوەستانی نییەو بە چاوێکی زانستییەوە دەیانڕوانییە مێژوو، مێژوویان کردە ئامرازێك یان چەکێك بۆ ڕیسواکردن و هەڵتەکاندنی دام و دەزگای ڕژێمی دەرەبەگی هەروەها دەیانویست دوا مووری پێوەندی نێوا کڵێساو مێژوو بپچڕێنن، مێژوونووسی ئنیگلیزی (ئەدوارد گیسون) کەو تا ئیمڕۆ قیبلەنومای گەلێك مێژوونوسی ڕۆهەلاتە دەیگوت (کڵێسە هەستی نیشتمانپەروەی لە گیانی مرۆڤدا ڕیشەکێش دەکات) ناحەزانی زانیاری پەروەر کە بە ڕۆمانسی ناویا دەکردووە شەیدای سەدە ناوەنجییەکان و دوژمنی باوەکوشتەی شۆڕشی فەرەنسی بوون، (بەشێکی زۆر لە ڕۆمانسییەکان ئەوانە بوون کە لەکاتی خۆی لە ناوشۆڕشی فەرەنسە هەڵهاتبوونە وڵاتانی تر) ڕۆمانسییەکان وەك یەك نەبوون، لیبراڵییەکانیان پاڵیان بە ڕەورەوەی مێژووەوە دەنا کەچی کۆنەپەرستەکانیان ویستیان بەرەو دواوەی بگێڕنەوە، ئەمەش دەستکەوتێکی تر بوو بۆ سەر زانستی مێژوو، بیروباوەڕی سۆسیالیزمی یۆتۆپی (اشتراکیة الطوباوی) مێژووشی گرتەوە، وەك (سان سیمۆن) (شارل فۆربیە)، (ڕۆبەبت فۆبێن)، سان سیمۆن دەیگوت (گەل هەوێنی ڕووداوی مێژوویییە خەباتی بۆرجوازی و جوتیار دەژی دەرەبەگ و کڵێسە ناوەرۆکی ئاڵوگۆڕییە، (تێری) مێژوونوس وای لە یەکێکی وەك مارکس کرد ناوی بنێت (باوکی خەباتی چینایەتی لە زانستی مێژووی فەرەنسیدا) سەدەی نۆزدە کەس

نەیتوانی بە ڕادەی فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمانی (هیگڵ) کاریکاتە سەر مێژوونوسانی ئەورووپا، یەکەم کەسە هەوڵی داوە ئاڵوگۆڕە ناوخۆکانی مێژوو دەستنیشان بکات، گوایە پێشخستنی مێژوو هەر لە قۆناغ و سەردەمێکدا یەکێك لە گەلانی جیهان ئەرکی ئەو پێشخستنەی دەکەوێتە ئەستۆ، بەڵام بەڕای مارکس و ئەنگلس جیاوازی لە نێوان گەلاندا نی‌یە هەریەکە دەتوانێت لە یەك جۆر باری ژیاندا بە گشتی یەك دەور ببینێت، خەباتی چینایەتی لایان بزبەرەی ئاڵوگۆڕی ڕووداوی مێژووی‌یە ئەنجامیش وەرچەرخانی باری ئابووری و دەسەڵاتی سیاسی‌یە کە لە چینێکی پاشکەوتووەوە دەچێتە چینێکی پێشکەوتووتر لە خاوەن کۆیلە بۆ دەرەبەگ لە دەرەبەگەوە بۆ بۆرجوازی و لەویشەوە بۆ پرۆلیتاریا، بە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا زانستی مێژوو هەنگاوی گەورەی بەوەر پێشەوەنا لێکۆڵینەوەکان بەرگی زانستیانە پۆشی، سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵ و ڕێکخراوی تایبەتی مێژوونوسان بوو، چەندەها گۆڤار دەرچو تایبەت بوو بە مێژوو، پەیوەندی نێوان مێژوونوسان و وڵاتانی جیهانی زۆر لە جاران بەهێزتر بوو، هەموو ئەمانە ڕێگەیان دا بۆ بە زانستکردنی مێژوو بە تایبەتی دوای شەڕی جیهانی یەکەم کە بە جارێك پەلی هاویشت و ژمارەی ئەو گۆڤارانەی بۆ باسی مێژوویی تەرخان کراون لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا خۆی‌دا لە چەند هەزار گۆڤارێك کە بە دەیان و زیاتر زوبانی

گەلانی جیهان دەردەچوون، ئەمانە هەستیان بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی و ئایینی کە کاریان کردە سەر هەموو جیهان ئەم هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی زاناو فەیلەسوفان و مێژوونوسان بۆ بە مێژوو کردنی مێژوو و دەراستکردنی مێژوو بوو کە دواجار بلیخانۆف قەڵەمبازێکی گەورەی بێداو بەرگی فەلسەفی کردە بەر بە شێوەیەکی یان بە مەفهومێکی مادیانە مێژووی شیکردەوە، ئەمانە ئەوە دەگەیەنن کە کەرەستەکانی مێژوو لە هەموو بوارێکەوە گەورەترین هەوێن بوون بۆ مێژووی مێژوو، مێژوو خۆی، شارستانیەت، کە گشت مرۆڤایەتی شانازی پێوە دەکات بمانەوێ و نەمانەوێ.


سەرچاوەکان:

١-مێژو د. کەمال مەزهەر- بغداد ١٩٨٣.

٢-رێنیسانس- د. کەمال مەزهەر- فوئاد مەجید میرسی کردوویە بە کوردی ١٩٨٤.

٣-نهێنی کۆنترین مێژوو- ا. گەربۆڤسکی- جەلال تەقی لە رووسییەوە کردوویە بە کوردی ١٩٨٠.

٤-ئەفسانە- د. نبیلە ابراهیم- وەرگێڕی لە عەرەبیەوە محمد بدری بغداد ١٩٨٦.

٥-تاريخ اوربا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية ١٥٠٠-١٧٨٩.
د. محمد محمد صالح ١٩٨٢ بغداد.
فەرهەنگۆك:
میتۆلۆژی- علم الاساطیر.
ئارکیۆلۆژی- علم الاثار- زانیاری دەربارەی رابردوو مرۆڤایەتی بەهۆی کەرەستەی پاشماوەی شوێنەوارەوە.
ئیتنۆگرافی- علم الاجناس- زانیاری دەربارەی شوێن و زانیاری و دروستبوون و رادەی رۆشنبیری و پێشکەوتنی گەلان.
ئەسترۆنۆمیا کە لە پەیدابوون و پەرەسەندنی ئەستێرەو لەشە ئاسمانییەکان دەکۆڵێتەوە.
فەسلەجە (فسلجە)- علم اللغة- العلاقة بین اللغة و البیئة.
ئیپۆس- ملحمە. داستان.

سەرچاوەکان:
١-فلسفة التاريخ- ج. بليخاوف_ بۆ مێژوو
٢-تاريخ التاريخ- على ادهم- دار المعارف- قاهرة ١٩٧٧.
٣-التاريخ مجاله و فلسفته- د. نورى جعفر- بغداد- مطبعة الزهراء ١٩٩٥.

٤-الفيلسوف والتاريخ- نماذج من التأويل الفلسفي للتاريخ- محمد جلوب فرحان- استاذ الفلسفة المساعد كلية التربية جامعة الموصل- بغداد ١٨٧٠.

٥-دراسات في فلسفة التأريخ - د. هاشم يحيى الملاح د. ابراهيم خليل احمد د. عماد احمد الجواهري د. غانم محمد الحفو -وزارة التعليم العالي و البحث العلمي- جامعة الموصل ١٩٨٨.

٦-هيگل- محاضرات في فلسفة التأريخ- الجزء الاول- العقل في التأريخ- ترجمة و تقديم د. امام عبدالفتاح امام -بيروت- دار النشر التنوير- بي ميژوو.

٧-ابن خلدون- المؤرخ و عالم الاجتماع و الفيلسوف- تأليف البروفسور- ناشانيل شمت - ترجمة أ. د. احسان محمد الحسن- دار المأمون بغداد ١٩٩٩.

٨-دور الجماهير الشعبية في التأريخ- اكاديمية العلوم السوفياتية- ترجمة د. بدرالدين السباعي/ د. نجاح الساعاتي- مراجعة يوسف حلاق -بيروت- الطبعة الاولى ١٩٨٢.

٩-الموسوعة الفلسفية- وضع لجنة من العلماء و اكاديميين السوفياتيين باشراف- م روزنتال- ب. يودين- ترجمة سمير كريم- بيروت الطبعة الثالثة ١٩٨١

١٠-ميژوو - د. کەمال مەزهەر ئەحمەد- بغداد ١٩٨٣.

١١-فێرکردنی فەلسەفەی زانستی- ئیحسان تەبەری- وەرگێڕانی د. حسن خەلیقی بغداد ١٩٩٤.

١٢-ڕێنیسانس - د. کەمال مەزهەر ئەحمەد- فوئاد مەجید میسری کردوویەتی بە کوردی- بغداد ١٩٨٣.

١٣-تاریخ اوربا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية ١٥٠٠-١٧٨٩ د. محمد صالح بغداد ١٩٨٢.

١٤-المدخل الى الفلسفة- صدام الزيادي- الجزء الاول ١٩٨٩.

١٥-اشتراكية ام فوضوية- جوزيف ستالين- ترجمة جورج طرابيش- بيروت ١٩٧٨.

١٦-ماركس الثامن عشر من بروميل لويس بونابارت- المجلد الاول- الجزء الثاني- ترجمة الياس شاهين- دار التقدم موسكو ١٩٨٠.

١٧-دەروازەی گۆڕانی کۆمەڵ- بەیاد عەبدولقادر ١٩٨٧.

١٨-نهێنی کۆنترین مێژوو- ا. گەربۆلسکی - جەلال تەقی لە ڕووسییەوە کردویە بە کوردی ١٩٨٠.

١٩-ئەفسانە- د. نبیلە ابراهیم- وەرگێڕی لە عەرەبییەوە محمد بدری بغداد ١٩٨٦.

# ناوەڕۆك

١- پێشەکیەکی کورت........................................٣
٢- دەروازەیەك بۆ فەلسەفەو مێژوو............................٥
٣- فەلسەفەی مێژوو........................................١٤
٤- پرۆژەی لێکۆڵینەوەی مێژوو لای هیگل.....................٢٣
٥- سروشتی مێژوو..........................................٤٤
٦- مێژووی نوسینی مێژوو...................................٤٦
٧- چینی‌یەکان و نوسینی مێژوو..............................٥٠
٨- یابانیەکان و نوسینی مێژوو...............................٥٢
٩- هندو نوسینی مێژوو.......................................٥٤
١٠- یەهودیەکان و نوسینی مێژوو.............................٥٥
١١- نوسینی مێژوو لای یۆنانیەکان و رۆمانیەکان..............٥٨
١٢- رۆمانیەکان و نوسینی مێژوو.............................٦٥
١٣- نوسینی مێژوو لەسەرەتای سەردەمی مەسیحیەتدا..........٦٧
١٤- نوسینی مێژوو لەسەدەی ناوەڕاستدا......................٧١
١٥- نوسینی مێژوو لەسەردەمی ئیسلامدا......................٧٣
١٦- (ئیبن خەلدون)و فەلسەفەی مێژوو........................٨٠

١٧- فەلسەفەی مێژوو لای هیگڵ........................ ٩٥
١٨- فەلسەفەی مێژوو لای سان سیمۆن........................ ٩٨
١٩- ڕاڤەکردنی (برتراند رسل)ی فەیلەسوف بۆ مێژوو........................ ١٠٠
٢٠- فەلسەفەی مێژوو لای مارکس و ئەنگلس........................ ١٠١
٢١- سۆشیال یۆتۆپییەکان و مێژوو........................ ١٠٢
٢٢- ڕۆشنگەران و مێژوو........................ ١١٨
٢٣- ڕاڤەکردنی جوگرافیایی بۆ مێژوو........................ ١٢٢
٢٤- ڕاڤەکردنی ڕۆحی بۆ مێژوو (لای هیگل)........................ ١٣٠
٢٥- ڕاڤەکردنی مەتریالیزمیانە بۆ مێژوو........................ ١٣٥
٢٦- ڕاڤەکردنی سووڕی (الدوری) بۆ مێژوو........................ ١٤٣
٢٧- ڕاڤەکردنی هونەری یان جوانی بۆ مێژوو........................ ١٥١
٢٨- پێکهاتەی مێژوو........................ ١٥٤
٢٩- ڕۆڵی تاکەکەس لەمێژوودا........................ ١٧٤
٣٠- کەرەستەکانی مێژوو........................ ١٨٦

## ژیاننامەی نووسەر

* ساڵی ١٩٧٣ لە گەڕەکی (ئیسکان)ی شاری کەرکوک لە دایک بووە..

* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواو کردووە..

* ساڵی ١٩٩٤ - ١٩٩٥ بەشی مێژووی کۆلێجی ئادابی تەواو کردووەو دووەمی بەشەکەی خۆی بووە.

* لە ١٩٩٩/١٠/٩ لەبەشی مێژووی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان لە خوێندنی باڵا وەرگیراوە..

* ساڵی ٢٠٠٢ بڕوانامەی ماجستێری لەبەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی بە پلەی زۆرباش بەدەست هێناوە.